# ئێما

## کۆمەڵکوژییەکەی دێرسیمم بینی








نووسینی: حسێن یڵدرم
وەرگێڕانی: کاوە ئەمین




له زنجیره بلاوکراوه‌کانی ڕێکخراوی کوردستان دیالۆگ

زنجیره‌ی کتێب: ١٤

# ئێما، کۆمەڵکوژییەکەی دێرسیمەم بینی

حوسێن یڵدرم

# ئێما، کۆمەڵکوژییەکەی دێرسیمم بینی

وەرگێڕانی لە سوێدییەوە

**کاوە ئەمین**

**له بڵاوكراوەكانی ڕێكخراوی كوردستان دیالۆگ (KDO)**

ناوی کتێب: ئیما، کۆمەڵکوژییەکەی دێرسیمم بینی
نووسەر: حوسێن یڵدرم
بۆ فەرەنسی: Gerard Chaaupin & Metin Achard
بۆ سویدی: ماتس لۆفگرێن
بۆ کوردی: کاوە ئەمین
هەڵەچنی: شادیە ڕەسووڵ
ژانر: گێڕانەوە
دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان
دیزاینی تێکست: ڕەنجدەر جبار
نۆرەی چاپ: چاپی دووەم ٢٠٢٢
چاپخانە: چاپخانەی کارۆ - سلێمانی
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٤٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٢٠٤)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێ دراوە.

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

گەلی کورد ئەزموونێکی خراپیان لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا هەیە، ئاخر ئەو دەوڵەتە هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە بە کۆمەڵکوژی و کوشت و بڕ لە کوردستان بەردی بناغەی دەوڵەتەکەیان هەڵچنی. یەکەمین کۆمەڵکوژی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم کە لە کوردستاندا کرا، دوای راپەڕینی کۆچگری بە سەرۆکایەتی عەلی شێر ئەفەندی، لەلایەن سوپای تورکیاوە ئەنجام درا. ئەوەش دوای ئەوەی عەشیرەتی کۆچگری ملیان بۆ داخوازییەکانی سوپای تورکیا شۆڕ نەکرد، بۆیە لە مانگی شوباتی ١٩٢١ رووبەرووی سوپای تورکیا بوونەوە، بەڵام دوای چوار مانگ لە هەمان ساڵدا شۆڕشەکە تێکشکێنرا و بە کۆمەڵکوژیەکی گەورە کۆتایی پێهات. بە گوێرەی هەندێک سەرچاوە نزیکەی دوو هەزار کەس لە ژن و منداڵ و گەورە و پیر بەشێوەیەکی دڕندانە کۆکوژ کران.

لە نێوان ساڵانی ١٩٢٥ – ١٩٣٠ واتە دوای سەرهەڵدانی شێخ سەعید و شۆڕشی ئارارات، لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە سەدان کەس لە سێدارەدران و بەناهەق کوژراون. بەڵام گەورەترین کۆمەڵکوژی لە ساڵی ١٩٣٠ لە دەوروبەری شاری

وانی باکووری کوردستان ئەنجامدار کە بە کۆمەڵکوژی (گەلی زیلان) ناسراوە. لە کۆمەڵکوژی گەلی زیلاندا کە رووبەرێکی بەرفراوانی جوگرافی لە خۆگرتووە، نزیکەی پەنجا گوند لەلایەن سوپای تورکیاوە سووتێنران و کاول وێران کران. بەگوێرەی راگەیاندنی تورکیا و تۆمارە فەرمییەکان پانزدە هەزار کەس کوژراون، بەڵام ئەوانەی گەواهی رووداوەکە دەدەن و دەگێڕنەوە دەڵێن ژمارەی کوژراوەکان دەگاتە پەنجا هەزاریش.

ئەوەی کە دەمەوێت لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم کتێبەدا باسی بکەم، واتە سەرهەڵدانی دێرسیم و ئەو کۆمەڵکوژییە بەسەر هەرێمی دێرسیمیاندا هێنا و دەکەوێتە قاڵبی جینۆسايد و کۆمەڵکوژییەوە، هیچی لە کۆمەڵکوژی ئەرمەن و جووەکان کەمتر نییە، بەتایبەتی لە شێوەی ئەنجامدان و ئەو میتۆدانە (شێوازانەی) خەڵکیان پێ لەناوبردوون، هەموو سنوورێکی نامرۆڤانەیان تێپەڕاندووە. پرۆفیسۆر دەیڤید کانت مامۆستای زانکۆ لە سوید، لە کۆنفرانسێکدا کە بۆ یادکردنەوەی کۆمەڵکوژی دێرسیم رێکخرابوو دەڵێت:"دەوڵەتی تورکیا بە شێوەیەکی سیستەماتیک و بەرنامەدار کۆمەڵکوژی دێرسمی ئەنجامدا کە نزیکەی بیست هەزار سەربازی تورکیا بەشداریان تێدا کردووە، ئەوەش ژمارەیەکی یەکجار زۆرە بە لەبەرچاوگرتنی ژمارەی دانیشتووانی ئەوکاتەی دێرسیم کە نزیکەی هەشتا هەزار کەس بوو."

دەیڤید کانت پێی وایە کە بەڵگەکان سەلمێنەری ئەوەن زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی کۆکوژ کراون، ژن، منداڵ و پیر و پەکەوتە واتە خەڵکی سڤیل بوون، چەکدار نەبوون،

ئاخر بە قسەی سەرچاوە تورکیەکان بێت تەنیا ١٣٠٠ پارچە چەک دەستی بەسەردا گیراوە، کەواتە ئەوانەی کوژراون خەڵکی مەدەنی و بێچەک بوون. بەڵام شایەتحاڵەکان ژمارەی قوربانییەک زۆر لەوە زیاتر دەزانن کە دەیڤید باسی لێوە دەکات.

مامۆستا مووسا عەنتەر لە یاداوەریەکانیدا ژمارەی قوربانییەکان دەگەیەنێتە حەفتاوپێنج هەزار کەس، باس لەوە دەکات کە سوپای تورکیا کوردە عەلەویەکانی بە دومەڵ لەسەر لاشەی تورکیا بەراورد کردووە و بەئەرکی خۆیانیان زانیووە ئەو دومەڵە لە ڕەگ و ڕیشەوە دەربهێنن. ئەوەی مووسا عەنتەر لەسەر زاری سەربازانی تورکیا دەیگێڕتەوە کە بەشداری کۆمەڵکوژی دێرسیمیان کردووە، هیچی کەمتر نییە لە درندەیی سەربازانی نازی و فاشییەکانی ئیتاڵیا و ئەو کۆمکوژیانەی بەدرێژایی مێژوو روویانداوە.

دەوڵەتی تورکیا بەتەواوەتی ڕەچاوی پاکتاوی نەژاری لە هەرێمی دێرسیم کردووە و هەوڵیداوە کورد بسڕێتەوە یان بیانکات بە کەمینەکەی بێکاریگەر چونکە هەر بە کۆمەڵکوژیەوەوە نەوەستان، خاکیان بە تورەکە بێژا، سەدان منداڵی بێدایک و باوکیان ڕەوانەی شارە تورکیەکان کرد، بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژرا و کرانە تورک و هەموو شتێکی خۆیان لە بیربردنەوە. تەنانەت گۆڕێکیان بە سەرکردەی سەرهەڵدانەکە، سەید ڕەزا بە ڕەوا نەزانی و شوێن بزریان کرد.

بە دۆکیۆمێنتکردنی ئەو تاوانانەی کە بەدژی گەلی کورد لە هەر چوار بەشی کوردستان ئەنجامدراون، ئەرکێکی

نەتەوەیی و مرۆڤانەیە و دەبێت داوا بکرێت هەموو بەڵگە شاردراوەکان بخرێنە بەردەست و دەوڵەتی تورکیا قەرەبووی مادی و مەعنەوی گەلی کورد بکاتەوە.

ئەوەی لەم کتێبەدا دەیخوێنینەوە بەسەرهاتی منداڵیی ژنێکی کوردە کە بەچاوی خۆی کۆمەڵکوژی دێرسیمی بینیووە. نووسەری کتێبەکەش کە خۆی پارێزەرێکی ناوداری تورکیا و باکووری کوردستانە بەشێوەیەکی وا جوان بەسەرهاتە هەقیقیەکەی دارشتۆتەوە، دەتوانم بڵێم تەنیا دەرهێنەرێکی سینەمایی بە توانا دەتوانێت شاکارێکی وا بخوڵقێنێت، ئاخ بۆ دەرهێنەرێکی کارامە ئەم بەسەرهاتە بکاتە فیلمێکی سینەمایی و پیشانی جیهانی بدات و روونی بکاتەوە لە وڵاتی ئێمەدا چی روویداوە، مەگەر هەر خوا بۆخۆی بزانێت چۆن بەرگەی ئەو هەموو نادادی و کارە نامرۆڤانەکانی داگیرکەرانی کوردستانمان گرتووە.

ئەم پەرتووکە بخوێننەوە و بزانە داگیرکەر تەنانەت رەحمی بە سەگی کوردیش نەکردووە، بۆیە چیچۆش لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێنن.

کاوە ئەمین

سلێمانی، پایزی ٢٠٢٢

# دەستپێک

سـەرەڕای ئـەو فۆرمـەی کتێبەکـە وەریگرتـووە، بـەڵام داسـتانێکی خەیاڵـی نییـە. نووسـەر هێنـدە بـە دیقەتـە، تەنانـەت نـاو و پاشـناوی کەسایەتیەکانیشـی نووسـیوە. ئێمـا (ئـەو ژنـەی کـە بەسـەرهاتەکە دەگێڕێتـەوە. وەرگێـڕ)، تەنیـا منداڵێکـە لـە یەکێک لـەو کۆمەڵکوژیانـەی کـە سـوپای تورکیـا لـە باکووری کوردسـتان کردوویەتـی، رزگاری بـووە، بۆیـە دراماکـە بـۆ هەتاهەتایـە کاریگـەری لەسـەر ژیانـی جێهێشـتووە.

ماوەیەکـی دوورودرێـژ، لـە هەوڵـی ئـەوەدا بـووە، بتوانێـت لـە مێژووەکـە بـگات، کـە هۆکارێـک بـووە بـۆ خوڵقاندنـی کارەسـاتێکی ئـاوا. بـە گەورەیـش هەسـت بـە قورسـایی ئـەو دابونەریتـە دەکات کە وەکو کراسـێک بە زۆر لەبەریـان کردبێت وایـە. بـە پێچەوانـەی هەمـوو دابونەریتـە کۆمەڵایەتییەکانـەوە، ئـەو حەیایـی ئـەوەی هەیـە کـە خۆشـەویستی بکات و منداڵێک بهێنێتـە دنیـاوە.

حوسـێن یڵـدرم، مـاوەی سـیازدە سـاڵ وەکـو پارێـزەر کاری کـردووە. هەتـا ئـەو کاتـەی لـە سـاڵی ١٩٨١ دەسـتگیر

دەکرێت، دوای ئەوەی بوێرانە لە دادگای شەڕدا، داکۆکی لە زیندانییەکان دەکات و لەو ڕێگەیەوە بە زیندانەکانی ڕژێمی ئانکارە ئاشنا دەبێت. بەهۆی گوشارەکانی ڕێکخراوی لێبووردنی نێونەتەوەیی و کۆمیسیۆنی پارێزەرانی نێودەوڵەتی کە کردبوویانە سەر تورکیا، دوای پازدە مانگ ئازاد دەکرێت. پێش ئەوەی ولات بەجێبهێڵێت، داوا لە ئێما دەکات، ئەو بەسەرهاتانەی کە راستەوخۆ لە بە سالاچووەکانی بیستووە، بۆی بگێڕێتەوە. ئێما قەت بڕوای بەکەس نەکردووە. ئەوە ئەو مێژووەیە کە لەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە. حوسێن یلدرم، لە ساڵی ۱۹۸۱ بەدواوە وەکو پەنابەرێکی سیاسی لە سوید دەژی.

گێراد چاوپیب و مەتین ئاچار، ئەم کتێبەیان لە تورکیەوە کردۆتە فەرەنسی.

# پێشەکی

کتێبی ئێما لینگە (شەل)، گێڕانەوەی بەسەرهاتێکە لەزاری شایەتحاڵێکەوە باسی سەردەمێکی تراژدی پارێزگای دێرسیم دەکات.

دێرسیم «دەرگای زیوینی» باکووری کوردستان (کوردستانی تورکیا. کەندال) بەچیای گەورە دەورە دراوە، دەکەوێتە ناوچەیەکی سەختەوە، دەوری رووباری ئەفسانەیی مونزووریان داوە. سەدان ساڵە لەم پارێزگایەدا، جۆرە فەرهەنگێکی کۆمەڵایەتی ئاشکرا و تایبەت گەشەی کردووە لەگەڵ هەستێکی بەهێز بۆ سەربەخۆییخوازی. داگیرکەرە گەورەکانی وەکو عەرەب و تورکە مەنگۆلیەکان، هەتا توانیبێتیان بەدەوری ئەو ماڵە هەڵۆیانەدا رۆیشتوون، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تەنیا دەستەڵاتێکی رەمزیان بەسەر ئەو ناوچەیەدا شکاوە، دەسەڵاتدارانِ سەربەخۆییەکی بەرفراوانیان بەو ناوچەیە دابوو. دەوڵەتی کۆماری تورکیا، هەتاوەکو کۆتای سییەکانیش، سیاسەتێکی وای لەو ناوچەیەدا رەچاو دەکرد.

دوای ئەوەی رژێمی تورکیا یەک لەدوای یەک ولایەتە کوردییەکانی خستە ژێر دەستی خۆیەوە و سەرکوتی کردن، ئینجا توانی خۆی لە «کێشەی دێرسیم» بدات. لە ٤ گولانی ١٩٣٧، ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا بە نهێنی بریارێکی بەمەبەستی راگواستنی دێرسیمیەکان بۆ رۆژئاوای تورکیا. ئەو ئۆپراسیۆنە (هێرشە) بە لێدانێک لە سەرهەڵدانە هەرێمیەکان بەدژی قانوونە سێکۆلارییەکانی دەوڵەت، ناوزەد کرا. سوپای تورکیا پەنای بۆ هەموو جۆرە کەرەستەیەکی شەڕ بە فرۆکەشەوە برد، بۆ ئەوەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە راوبنێت و پاکتاویان بکات.

بیرەوەریە دەستەجەمعیەکانی کورد هەتاوەکو رۆژی ئەمرۆش کاریگەری ئەو رووداوە دراماتیکیانەیان بەسەرەوەیە، لە شیعر و گۆرانی کوردیدا، رەنگیان داوەتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە، مێژوونووسانی سەربە دەوڵەت، ئەو رووداوانەیان پشتگوێ خستووە و پەردەیەکی رەشیان بەسەردا داوە.

ئەو خزمەتە گەورەیەیی نووسەر کردویەتی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، ئەو شایەتانەی کۆکردۆتەوە کە بەچاوی خۆیان شتەکانیان بینیوە و پاشانیش بەو دۆکیۆمێنتانە دەوڵەمەندی کردوون کە هێشتا بڵاو نەکراونەتەوە.

حسێن یڵدرم،خۆی خەڵکی ئەو پارێزگایەیە، لە گێرانەوە زیندووەکانیدا، سەرلەنوێ، شێوەی بیرکردنەوە، بیروباوەرە ئاینیەکان، عادات و تەقالید، کۆدەکانی شەرەف، هەروەها هونەری ژیان و مردن لەو پارێزگایەدا زیندوو دەکاتەوە، لەزۆر رووەوە تەنیا میراتیەکن لەو عادات و تەقالیدە هەزار ساڵەییەی کە ماونەتەوە، بەڵام لە زۆر شوێنی دیکە لەناو

چـوون، یاخـود گۆڕانیـان بەسـەردا هاتـووە. ئـەم گێڕانەوانـە لەسـەر قوربانیەکانی دیکە، زیاتر سەرنجراکێشن کە هەمیشـە کاریگەریـان لەسـەر بووە و بیری تۆڵەسـەندنەوە، رق و کینـە، دژە راسیسـتی تورکـی و هەمـوو تەڵـە و داوەکان، نەکراوەتـەوە. قوربانیـەکان، خەموپەژارەکانیان بـۆ نەوەکانـی داهاتـوو دەگێڕنـەوە، مێـژووش راسـتیەکانی خـۆی لەشـێوەی بەڵگـەدا، دەردەخـات.

لـەم پەیوەندیەدا، ئێمـا، هۆکارێکی تابڵیی بەکەڵکە بۆئـەوەی، کورد و مێژوو و بیرەوەریـە ناوخۆییەکانیانانی لێوە بناسیت. ئـەم کتێبـە کەڵکـی ئـەوەی هەیـە وەربگێردرێتـە سـەر زمانـە رۆژئاواییـەکان و بکرێتـە سـەرچاوەیەکی زانیـاری بـۆ ئـەو خوێنەرانـەی ئارەزوویانـە لـە سـەر کـورد و تـورک زانیاریـان هەبێت، بەدیوێکی دیکـەدا بـۆ ئاشـنابوون بـە مێژووی خەباتـی گـەل و شـێوەی بیرکردنەوەیـان.

کەندال نەزان

# بەرکولێک

نیوەڕۆیە، هەتا بڵێی گەرمە، شەماڵێکی هێواش کە بەحاڵ هەستی پێ دەکرێت، خشە خشێک بە سپیدارەکان دەخات، لە گۆرانییەکی نزمی سروشت دەچێت. پارێزەرەکە (نووسەر) لە شاری ئێلاگیز لە پاسەکە دێتە خوارەوە، هەروەک بەڵێنی بەخۆی دابوو لە ژێر سێبەری دارێک دەوەستێت، بۆ ئەوەی لە ڕووباری مونزوور بڕوانێت. پێش ئەوەی چاوی بە دایکی بکەوێت، دەیەوێت بەشێوە تایبەتییەکەی خۆی، ، لە نەگبەتی، رق و کینە و غەزەب، خۆی رزگار بکات. ئەو دەزانێت بە درێژایی مێژوو، ئەو ڕووبارە، هێزی خۆی پاراستووە، تاوەکو هەموو ئەتککردن و بەد ئەخلاقی و هەموو ئەو خوێنانەی رژێندراون، بسڕێتەوە. بەزەحمەت بەرەو لای گۆڕەپانی ناوەڕاستی شار هەنگاوی نا، هەموو گیانی لە ئارەق هەڵکشابوو، چاوەکانی نوقان بۆ ئەوەی بێتەوە سەرخۆی. بەرەو کوچەی گەرەکەکەیان هەنگاوی نا، نیگای لەگەڵ دەموچاوە ئاشناکاندا یەکانگیر دەبوو، بەڵام هێشتا میهرەبانی خۆیان نیشان نەدابوو. کەس ئەوی نەدەناسییەوە. بیری کردەوە چۆن رژێمی سەربازی ترسی خستبووە نێو دڵیانەوە: «سەرەڕای ئەوەی تازە لە

زیندان هاتۆتە دەرەوە، ئەوان ناوێرن سڵاویکیشی لێ بکەن"!
دوای ئەوەی دەگاتە نزیک خانووەکەیان، لەپڕ دایکی پەیدا دەبێت. وەکو هەموو ژنە پیرە کوردەکانی دیکە لەچکەیەکی بەسەر سەریدا دابوو، بلوسێکی سوور و پانتۆڵیکی خەت خەتی لەبەردابوو، وا پێدەچوو بە پەلە بەرەو لای ئەو دێت. پارێزەرەکە هەنگاوەکانی گورج دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بیگاتێ و دەستەکانی ماچ بکات. بەڵام ئەو هێندە گۆڕابوو تەنانەت دایکی خۆیشی نەیناسییەوە، دایکی زۆر گوێی پێنادات، بەرەو پێشەوە ملی ڕێگای گرتووە، بەڵام کاتێک دەگەنە یەک، بەسەر سوڕمانەوە گوێی لە پرسیارێک دەبێت:

- خوا ئاگارت بێت! دەڵێن کوڕەکەم لە زیندان هاتۆتە دەرەوە، بەڵام گوایە دەوڵەت جارێکی دیکە گرتوویانەتەوە، ئایا لەوبارەیەوە هیچ دەزانیت؟

ئەو نازانێت چۆن وەڵامی بداتەوە، لەپڕ شتێکی بەخەیاڵدا دێت.

- کوڕەکەت لە نێو شارە، وەرە با بچین بیدۆزینەوە.

دایکەکە، دڵی خۆش دەبێت.

- بەقوربانت بم، بمبە بۆ لای کورەکەم.

بەرەو نێو شار دەکەونە ڕێگا، بەڵام هێشتا دە مەتر دوورنەکەوتوونەتەوە، عەلی خزمیان پەیدا دەبێت، تەمەنی لە حەفتا ساڵ زیاترە، لەوبەر جادەکەوە هاواری لێ دەکات:

- هۆ کاک حوسێنی بەرێز!

بەخۆی گۆچانەکەی دەستییەوە لە جادەکە دەپەڕێتەوە، پارێزەرەکە لە ئامێزی دەگرێت. ئیتر دایکە تێدەگات کە ئەوەی

لە تەنیشتییەوە وەستاوە، کوڕەکەی خۆیەتی و لە پرمەی گریان دەدات. پیاوە پیرەکە دەبینێت لە ڕۆیشتندا حوسێن نەختێک بۆی دەلەنگێت، بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە داوای لێ دەکات، پێڵاوەکانی داکەنێت، بۆ ئەوەی پێیەکانی ببینێت. ئەو لە پرسیارەکەی تێناگات، بەڵکو پێی دەڵێت:

- بڕۆ، کەسە خۆشەویستەکەم، با بچینەوە بۆ ماڵەوە، پیاو لەم سەرجادەیە شتی وا ناکات.

پارێزەرەکە سەیرێکی دایکی دەکات، بەهات و هاوار هەموو گەڕەکەکەی تێکەیاندووە، دایکە، بەسیەتی. ئاخر تۆ فرمێسکێکت بەچاودا نەهاتە خوارەوە، دوای کۆمەڵکوژەیەکی دێرسیم، لاشە رزیوەکەی باوکمتان بە خاک سپارد، ئێستا بۆ وا بە کوڵ دەگریت؟

فرمێسکەکانی دەسڕێت و دەڵێت: دەزانیت، بیستوومە کە پیاوێکی ئازایان لە زینداندا کوشتووە. وەکو دەڵێن ئەو پیاوە، پیر (پیاوچاکی عەلەویەکان)، عەلەویەکی خۆمان بووە.

نیگای دایکە لەسەر قژی کوڕەکەی دەگیرسێتەوە، کە وەکو مووەکانی لاشە لاوازەکەی لە زینداندا بۆز بوون. دەچنە ژوورە گەورەکەوە. جارێکی دیکە پیرە پیاو بەبێ ئارامی داوا لە پارێزەرەکە دەکات:

- بۆ خاتری ئەو خودایە، گۆرەویەکانت دابکەنە، با پێیەکانت ببینم.

کاتێک گۆرەویەکانی دادەکەنێت، جێگای ئەشکەنجە بە پێیەکانیەوە دیارە، خزمەکەیان کە دەموچاوە چرچ و چۆڵەکانی شایەتی ئەوەی بۆ دەدەن کە ئەو جۆرە ئەشکەنجانەی لەسەر تاقیکراوەتەوە، بەردەوام دەبێت:

- کاک حوسێن، من زۆر بە چاکی، ئەم جۆرە برینانە دەناسمەوە.

بەدرێژایی ئەو دوانیوەڕۆیە، خزمە بە تەمەنەکەیان ئەو ناهەقیانەی بۆ دەگێڕایەوە کە لە کاتی سەرهەڵدانی دێرسیمدا لێیان کراوە، پاشان خواحافیزی لێدەکات.

- کاک حوسێن، ئێوەش ماندوون، پێویستت بە حەسانەوەیە، سەردانت دەکەمەوە. بەرەو ماڵ، دەکەوێتە ڕێ. بەڵام پارێزەرەکە ناتوانێت بیر لە زیندانی دیاربەکر نەکاتەوە، بیرەوەرییەک لە ماڵیشەوە لە یەخەی نابنەوە، تەواو شەکەت و ماندوو بووە، هەموو گیانی بەهۆی پاشماوەی ئەشکەنجەدانەوە، دەکزێتەوە. کاتێک لەگەڵ دایکی بەتەنیا دەمێننەوە، لە پڕ وا دەزانێت لە دۆزەخەوە هاتووە بۆ ئەو بەهەشتەی کە لای دانتێ (Dante) شکڵی گرتبوو.

قاچەکانی هێندە لاواز بوون بەحاڵ دەیانتوانی هەڵیبگرن، چاوەکانی نەخۆش کەوتبوون، ملی باریک و ڕوومەتەکانی تێک قوپابوون، ئەوەی هێندەی دیکە خەمباری دەکات ئەوەیە کە دایکی لێی ناپرسێت چی بەسەر هاتووە، یانیش بۆ وا لەڕولاواز بووە.

نیشانەکان، نیگاکان، هەڵسوکەوتەکان بۆ خۆیان قسە دەکەن، ئەوەی لەماوەی ئەو پازدە مانگەدا، دایکی لەسەر کوڕەکەی لە زینداندا بیستبووی، وایکردبوو خوێن لە دەمارەکانیدا بیبەستێت.

وەکو دیکە، شتێکی گونجاو نەبوو، پارێزەرەکە دابنیشێت و باسی ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە لە زیندان

کێشابووی، بیگێڕێتەوە. کاتێکیش تەماشای دایکی دەکرد وا بە بێدەنگی دەگری، بیر لەو هەزاران ژنانە دەکاتەوە و بەخۆی دەڵێت: "نابێت ئەوان ئاوا عەزاب بچێژن، نابێت چیدیکە فرمێسک و خوێن برێژن".

بەڵام ئەو هیچ وشەیەک شک نابات بۆ ئەوەی دڵنەوایی دایکی پێ بداتەوە، بۆیە روو لە ژووره گەورەکە دەکات.

خانووەکانی تونجەلی (دێرسیم)، بەشێوەیەکی مۆدێرن فەرش کراون. مێزێکی لە دارگوێز دروست کراو، تەپڵەکێکی مەرمەڕی جگەرەی لەسەر دانرابوو، ئەویش لەسەر فەرشێک لەسەر شێوەی کۆنی کوردەواری چنرابوو، قەنەفەکان لە مەخمووری سوور هەڵکێشرابوون. بە دیوارەکەدا وێنەی ناوچەیەکی دێرسیم هەڵواسرابوو، فیشەکلەغێک کە بە گوللەی گەورە داگیرابووەوە بە بزمارێکی زەرد لەسەر تابلۆیەک هەڵواسرابوو، دیمەنی سەرچاوەکانی مونزووری نمایش دەکرد. دەچێتە بەردەمی کتێبخانەی براکەی، ئەویش هەر پارێزەر بوو. کتێبێک دەردەهێنێت بەناوی «سەرهەڵدانی کوردان لە ئەرشیفی ستادی جەنراڵەکاندا"، لەسەر قەنەفە قڵەوەکە دادەنیشێت، یەکەمینجارە ئەو بەرهەمەی بەردەست دەکەوێت کە لەسەر بنەمای دۆکیۆمێنتە نهێنییەکان نووسراوە، بەسەرسوڕمانەوە دەکەوێتە هەڵدانەوەی لاپەرەکانی. لەپڕ چاوی بە سەردێڕی یەکێک لە پاشکۆکان دەکەوێت و دەست بە خوێندنەوەی دەکات. بەیاننامەیەک لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە لەمەڕ هێرشێک بەناوی «پاکتاوکردن» لە ساڵی ١٩٣٧ لە دێرسیم دەستی پێکرد.

## زۆر نهێنی

## بەیاننامە

٤ مای ١٩٣٧
نووسینگەی سەرۆک وەزیران
هێڵی گشتی

لەسەر ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ سەرهەڵدانەکانی ئەم دواییەی هەرێمی تونجەلی(دێرسیم) ئامادەکراون، بە ئامادەبوونی ئەتاتورک و سەرلەشکری سوپا، لێکۆڵینەوە و گفتوگۆیان لەسەر کرا و ئەم بڕیارانە دران:

١. دەبێت، ئەو هێزە چەکدارانەی کە یەکیان گرتووە، لە هێرشێکی بەهێز و بەکاریگەردا، خۆیان بگەیەننە هێڵەکانی نازمییە، کێتچیزە کەن (ئاساگی بۆر)، سینە و کارۆگلان.

٢. دەبێت ئەمجارە دانیشتووانی ئەو ناوچە ڕاپەڕیوانە بگوێزرێنەوە بۆ جێگایەکی تر {...}، دەبێت لە هێرشەکانی سەر گوندەکاندا، دەستبگیرێت بەسەر هەموو چەک و تەقەمەنییەکدا، دانیشتوانەکەش ڕابگوێزرێن. دەوڵەت حسابی ئەوە دەکات کە دەستبەجێ دوو هەزار کەس بگوێزرێنەوە.

دەوڵـەت لەسـەر ئـەو بڕوایەیـە کـە لـە هێرشـێکی سـووک دا، بتوانرێـت سـەرچاوەی ڕاپەریـوەکان بێکاریگـەر بکرێـت. بەمانایەکـی تـر لـە لایـەک کاریگـەری ئەوانـەی کـە چەکیـان هەڵگرتـووە نەهێڵێـت، لـە لایەکـی تریشـەوە بـە شـێوەیەکی سیسـتەماتیک گوندەکان کاول و خاپوور بکرێن و خێزانەکانیش پەراوێـز بکرێـن.

لەسـەر ئـەو بنەمایـەی کـە ئێسـتا لـە بەرەکـەدا، هێـزە پەروەردەکراوەکانـی مالاتیـا و ئانـکارای لێـن، لـە ڕێـگای چالاکییـە موخابەراتیـەکان لـە ناوچەکـە، بەتالوێنیـک ڕێکبخرێـت و لـە دیاربەکـرەوە ڕەوانـەی ئـەوێ دەکرێـت، دەبێـت لەمـاوەی یـەک هەفتـەدا، واتـە ١٢ مـای ١٩٣٧، دەسـت بـە هێرشـکردن بکرێـت.

تێبینـی: دەبێـت بـە هـەر نرخێـک بێـت، خەڵکێکـی زیاتـر کارا بکرێـن، دەبێـت کەڵـک لـە گرووپەکانـی ناوچەکـە بـە قازانجـی خۆمـان وەربگیرێـت، ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی کـە دەبێتـە هـۆکاری ئـەوەی بودجەیەکـی زیاتـر تەرخانبکەیـن.

پارێزەرەکە هەسـت بـە دەرکردنی ئارەقێکی سـارد دەکات. بەراوردێکـی بـاری نائاسـایی سـاڵی ١٩٣٧ لەگـەڵ ئـەوەی ئێسـتا ١٩٨٢ دەکات. بیر لە هاوڕێکانی دەکاتەوە کە هێشتا لە دۆزەخی زینداندا ماونەتـەوە، ئەوانـەی بوونەتـە قوربانـی ئـەو قانوونـە نوێیانەی کە تازە دەرکراون، بەڵام هیچیان لە قانوونە کۆنەکانی پێشـوو کەمتر نییـە. دەنگێـک لـە چێشـتخانەکەوە دێت، تـەلاری بیرکردنەوەکانـی دادەڕمێنێت. هەسـت دەکات کـە چۆن کەمێک خەمگین بـووە. گوڕێـک بەخـۆی دەداتـەوە و هەڵدەسـتێتەوە، بـەرەو دەرگاکـە دەچێت. سـەیر دەکات ئـەوە ئێمـا لەنکە (ئێمـا

شەلە)ە، بەخۆی و پرچە تەواو سپی و دەموچاوە چرچ هەڵاتووەکەیەوە، تف لە قورگیدا وشک دەبێت. ئەوەی کە لە هەمووی زیاتر کار لە مرۆڤ دەکات، دەستە لاوازەکەی ئێمایە، کە هەر لە منداڵییەوە زیادی نەکردوو، وەکو پارچەیەکی بێگیان پێیدا هەڵواسراوە. چاو لە چاوی پارێزەرەکە دەبڕێت، بەڵام ئەو ناتوانێت لەسەر ئەو قاچەی بووەستێت کە ئیفلیج بووە. بەیارمەتی قاچەکەی تری دەتوانێت باڵانسی خۆی ڕابگرێت. دەموچاوی وەکو بەردێکی ڕەقی لێهاتبوو، چاوەکانیشی کزو داماو بوون. سەرپۆشێکی سپی دابوو بەسەریا و کراسێکی ئاوادامانی ئاڵو واڵای لەبەردابوو.

پارێزەرەکە نەیتوانی چیتر لەوە زیاتر چاوەڕێ بکات. بەرەو پیری چوو، ماچی کردو و پاشان دەستی گرت، چووە ژێر باڵی تا لەسەر قەنەفەکە دابنیشێت. یەک وشە لەدەمی ئێماوە نەهاتە دەرەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە چاوی لەسەر پارێزەرەکە هەڵندەگرت. بۆ ئەوەی لەو حاڵەتە ڕزگاری بێت، پارێزەرەکە بەشێوە زاراوەی دەرسیمی، زازاکی، لێی پرسی حاڵ و ئەحواڵت چۆنە؟ ئاخر، ئێما تورکی نەدەزانی و زۆر چارەی ئەوانەیشی ناوێت کە بەو زمانە قسان دەکەن.

- من باشم، ئەی بۆخۆت چۆنیت؟ خوا دەست بە باڵتەوە بگرێت و لە هەموو دەرد و بەڵاو لە زاڵمان و کار و کردەوەیان بتپارێزێ.

بێگومان، پارێزەرەکە پیشتر گوێبیستی ئەو بەسەرهاتە ببوو، کە ئێما دەربارەی سەرهەڵدانەکەی دێرسیم و ئەو چەوساندنەوە زاڵمانەیەی بەدوای ئەو ڕووداوەدا بەسەریان هاتبوون. هەندێک لە ڕووداوەکان وایان لێدەکرد کە بیربکاتەوە، هەندێک جاریش، بە ڕووداوە بچکۆلەکان

پێدەکەنی. بەڵام لەدوای زیندانی دیاربەکرەوە، ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو، دەیویست بچووکترین شت لەسەر ئەوەی کە چی لە دێرسیم ڕوویدابوو، بزانێت.

ئێما، کلیلی کردنەوەی زۆرێک لە نهێنییەکانە، بۆیە دەیەوێت بەهەر نرخێک بووە، کارێک بکات، کە ئێما بڕوای پێ بکات. ئاخر، ئەو شارەزایی لەسەر بەشێک لە مێژووی ئێما هەبوو، بەڵام زۆر لایەنی تری ژیانی ئەو هەبوو کە هیچی لە بارەیەوە نەدەزانی. هەتا ئەو کاتەش، ئێما ئەو نهێنیانەی وەکو شتێکی شەخسی خۆی، تەنیا لای خۆی هێشتبووەوە. هەرکەسێکیش باسی ئەو مەسەلەیەی بکردایە، ئەو خۆی لێ کەڕ و کاس دەکرد.

پارێزەرەکە، زۆر بە کورتی و بە چەند وشەیەکی سادە باسی ئەو ماوەیەی کە لە زیندانی دیاربەکر بەسەری بردبوو بۆ ئێما گێڕایەوە و ئینجا پرسیارێکی ئاڕاستە کرد: دەمەوێت داوای شتێکت لێ بکەم. ئەگەر منت خۆش دەوێت و دەتەوێت چاک ببمەوە، ئەگەر نرخێک بۆ خزمایەتیەکەمان دادەنێیت، دەتەوێت خوا ڕەحم بە دایکم بکات، ئەوا دەبێت قسەم بۆ بکەیت!

ئێما کەمێک بیر دەکاتەوە.

- باشە، پێم بڵێ دەتەوێت چی بزانیت، ئێما وا دەڵێت.
- بەڵێنم پێ دەدەیت کە وەڵامم بدەیتەوە؟ پارێزەرەکە بە گومانەوە لێی دەپرسێت.
- ئا، بەڵێن بێت، ئەگەر بتوانم.

پارێزەرەکە، زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات و دەستەبەجێ جانتا دەستییەکەی لەژێر مێزەکەیەدا دەردەهێنێت، دەفتەرێک

و قەڵەمێک دەردەهێنێت و دەیخاتە سەر ئەژنۆی. سەیرێکی دەموچاوە بێگەردەکەی ئێما دەکات.

- چیت بەسەر هاتووە هەموویم بۆ بگێرەوە، باسی هەموو ئەو شتانەم بۆ بکە بە چاک و بە خراپ کە بەناچاری بەسەریاندا هێناوی. ئەوەی کە دەیزانیت بەبێ دوودڵی و شەرم کردن یانیش وا هەست بکەیت کە ناڕەحەتت دەکات.

پاش تۆزێک، ئێما، بە پەشۆکاویی و بە بڕوا بەخۆبوونەوە دەڵێت:

- ئەوەی کە تۆ دەتەوێت بۆت بگێڕمەوە، گرنگترین شتە کە بەسەرم هاتووە. من دەمەوێت کە ئەم دنیایەم بەجێهێشت، ئەو نهێنیانەش لەگەڵ خۆم بەرمە ژێر گڵەوە، لای کەس باسیان نەکەم. بەڵام تۆ دەمارێکی لاوازی منت گرت، ئاخر خۆت دەزانیت کە من چەندە تۆم خۆشدەوێت!

لەبیرتە بۆ دڵنەوایی کردنت، بە دڵێکی پڕ لە خەفەتەوە، دەستە بچکۆلانەکانی تۆم ماچ کرد تا داوای لێبووردنت لێ بکەم. پێش ئەوەی بتگرن و بتبەن بۆ زیندانی دیاربەکر، زۆر گوێت بە ڕابردووی من نەدەدا. ئێستاش کاتێک تۆ پرسیاری ئەوەم لێ دەکەیت، ئەوا منیش هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، تەنیا شتێک هەیە کە نازانم لە کوێوە دەست پێبکەم.

- پارێزەرەکە بە چرپەیەک پێی دەڵێت، لە سەرەتاوە.

ئێما، بە ئێش و حەسرەتەوە، بیر لەسەردەمی سەرەتای لاوێتی خۆی دەکاتەوە، بەم شێوەیە دەست بە گێڕانەوەکەی دەکات.

# ١

براکەم، دەست بکە بە نووسین و داوام لێ بکە بە وردی ڕووداوەکانت بۆ باس بکەم، ئەوەش بزانە هێشتا بیرو هۆشم لە دەست نەداوە. ئەوەی کە بینیومە، بیستوومە و خۆم لەگەڵیدا ژیاوم، هێشتا هەمووی لە نێو دڵ و دەروونمدا دەژی. با لەسەرەتاوە باسی سەردەمی منداڵی خۆم و گوندەکەمان، گالبوسانت بۆ بەکەم.

ئەگەر بیروهۆشم خیانەتم لێ نەکات، ئەوا لە مانگی ئاوگوستی (ئاب) ١٩٣٨ لە گوندەکەمان دەژیام. هەر وەک خۆشت دەزانیت، گوندەکەمان لە دامێنی ئەو شیو و دۆڵەدا هەڵکەوتبوو، بە قەراخ گوندەکەماندا ئاوێکی بەخوڕ دەهاتە خوارەوە، هەمان ناوی هەبوو، واتە گالبوسان. حوسێن باری بەرانبەری ئێمە لەوبەر کەنارەکەوە دەژیا. سەید باکیل و کاک عەلی بەرتی لە نزیک ئێمەوە لە قەراخ ئاوەکەدا دەژیان. لە نێوان ئەو دوو خانووەدا، چەمێک بەخوڕ دێتە خوارەوە. ئەو ئاوە لە شاخی سپییەوە دێتەوە خوارەوە، هەر لەوێش ئاشێکی لێبوو، بە شەو و بە ڕۆژ، ئیشی دەکرد.

دراوسێی هەرە نزیک لە ئێمەوە خدری سەید باکلیسی بوو.(ئیسا ئیڤشی) و (خیدە ئیش) نەختێک لەو لاترەوە دەژیان. کەمێک لە خوارترەوە، کانییەکی ساردی لێبوو بەناوی (هینی ساردین)، کە لە نێو تاشە بەردەکانەوە هەڵدەقولا.، ئاوەکەی هێندە سارد بوو کەس نەیدەتوانی، یەکسەرە قومێکی لێ بخواتە. گوندەکەمان پاڵی بە شاخی زاگرۆڤیتەوە دابوو و چواردەوری بە دارستانێکی چڕ گیرابوو، کە لەلایەن دانیشتوانی گوندەکەوە پێیان دەگوت دارستانی زاگرۆڤیت.

لەمبەر ڕووبارەکەوە واتە بەبەری لای ئێمەوە، دارستانێکی چڕی هەمەڕەنگ هەڵچوو بوو، کەچی سپی دارەکانی ئەوبەر ڕووبارەکە وایان نیشان دەدا کە سەریان لە ئاسمان گیر کردبێت. با، بە هێواشی دەیلەراندنەوە. لە پشت ئەو دارانەوە، ئاشێکی دیکەی لێ بوو بە ئاوی ڕووباری گالبووسان کاری دەکرد. پیرەکان دەیانگوت لەسەردەمی ئەرمەنییەکاندا دروستکراوە. لە پشت خانووەکەی حوسێن بارییەوە، دەتوانرا ئەو خانوانە ببینرێن کە هی(دۆیەقەر)، مستەفایا دەروێش و حوسێن تووسیک بوون. بە تەنیشت خانووەکەی تووسیکدا، چۆگەیەک بە خوڕ دەهاتە خوارەوە پێیان دەگوت ڕووباری حوسێن تووسیک.

ڕووباری گالبووسان، ئاویی زەوییەکانی ئێمەی دەدا، هەرچەندە زەوییەکانمان زۆر نەبوون بەڵام هەتا بڵێی بەپیت و بەرەکەت بوون، بەشی هەموو پێداویستییەکانی خۆمانی دەکرد، گەنم، جۆ، هەرزن، بیبەر، تەماتە، ئارو(خەیار)، سیر و پیڤاز. بزنەکانیشمان خۆیان بە گەلای داربەڕووەکان تێر دەکرد.

گوندی گالبووسـان خۆی بە لووتکەکانی چیایی زارگۆڤیتەوە هەڵواسیبوو، بەباشـی دەشـتی پیرگیدی لێوە دیار بـوو، لەوێوە خۆی درێژ دەکردەوە هەتا دەگەیشـتەچیای پولیَ سـۆبوونی.

لـە پایزانـدا، کاتـی دەغـڵ و دان هەڵگرتـن، هـەردوو ئاشـەکە دەبـوون بەیەکێـک. خەڵکـی ئـەو دەڤـەرە، بـە شـەو و بـە ڕۆژ دەهاتـن بـۆ هاڕینـی گەنمەکانیـان، پاشـان بـە خۆیـان و فـەردە ئـاردی پـڕەوە دەگەڕانـەوە.

بەهاران، گوڵ و گژوگیا، بە بەرگی ئاڵاو والاوە، ناوچەکەیان دەڕازاندەوە، هەمـوو شـتێک لـە جوانیـدا نقووم دەبوو. ئێمـەش بـە بۆنـی ڕێحانـە، گوڵەوەنەوشـە و نێرگـز، مەسـت دەبوویـن. پەپوولـە و مێش هەنگـەکان بەبێ مانـدوو بـوون، لـەم گوڵـەوە دەفڕیـن بـۆ ئـەو گـوڵ، بوولبـول و چۆلەکەکانیـش بـە ئەسپایی دەیانخوێنـد.

بۆ ئێمـەی منداڵان، وەرزی بەهـار، مانایەکی تایبەتـی هەبوو. هـەر لـە بەیانـی زووەوە دەچووینـە دەرەوە تـا چاودێری مـەڕ و بزنەکانمـان بکەیـن و بـۆ نـاو دارسـتانە چڕوپڕەکانمـان دەبـردن. یاری(عەلـی فاتیـک) مـان دەکـرد کـە ئەوهـا بـوو، یەکـە یەکـە پەڕەکانـی گوڵێکمـان لێدەکـردەوە هەتـا دواپـەڕە، پاشـان یـەک بـەدوای یەکدا دەمانگـوت «بـراوە» یـان «ون بـە».

تاجەگوڵمـان دابـەش دەکرد، شیلەی گوڵـە کەنگری کێوییمان تێکـەڵ دەکرد و دەمانکرد بە بنێشت. کاتێکیش لەسـەر هەندێک لەبـەردەکان دەمانماڵینـەوە، دەسـتەکانمان ڕەنگـی گوڵەکانیـان دەگرت.

کاتمان بە سێبەری خۆمان دەپێوا، بەبێ هیچ دەردەسەرییەک خواردنمان بەدەست دەخست، ئاخر ئێمە گژوگیا ژەهراوییەکانمان دەناسینەوە.

پێش رۆشتنەوەمان بۆماڵەوە، کاتێک خۆر ئاوا دەبوو، دەچووین بۆ سەر ڕووبارەکە و کەمێک یاریمان دەکرد.

من تاقانە کچی دایک و باوکم بووم، هەربۆیە هەموویان بە براکانیشمەوە وەک پەرستن دەیانپەرستم، هەموو خۆشەویستی خۆیان بەمن دابوو. هەتا بڵێی ژیکەڵە بووم، قژێکی درێژ و دەمووچاوێکی خڕ و کوڵمەکانیشم سووریان دەکردەوە، هەربۆیە زۆرجار دەبووم بە جێگای قسەوباسێکی زۆر.

وەک دەڵێن، دوای ئەوەی هەر شەش براکەم بەدوای یەکدا لە دایک دەبن، رۆژێک دایک و باوکم لە دەمەوخۆرائاوبونێکدا ڕوو دەکەنە خۆر و دەستیان بەرەو ئاسمان بەرزدەکەنەوە، دەپاڕێنەوە کە کچێکیان ببێت.

دەچنە زیارەتی زۆر لە چاک و پیران، لە نێویاندا دایە فاتمە، لەوێ خێرێک دەکەن، وەک دەڵێن دوعاکانیان قبووڵ دەبێت و، من لە دایک دەبم.

باوکم، حوسێن، پیاوێکی لەڕو لاواز و باڵا مامناوەندی بوو، هەمیشە دەم بە پێکەنین و ڕووخۆش بووە، زۆر بە منداڵەکانیەوە پەیوەست بووە و پیاوێکی بە ئیعتیبار و لەگەڵ دراوسێکانیدا بە چاکی هەڵیکردبوو. سمێڵەکانی درێژ و برۆکانیشی پڕ و ئەستوور بوون. ئەو هێشتا منداڵێکی بێچارەی تەمەن شانزدەساڵان دەبێت کە لەگەڵ دایکم زەماوەند دەکات، دایکم ژنێکی کامڵی نزیکەی تەمەن بیست

سالان دەبێت. وەکو گاڵتەکردن دەڵێن کە ئەو لە تەمەنی لاوێتی و تازە زاوەیەتیدا، نەیوێراوە بچێتە (ژووری بوکێ)ەوە. ڕۆژێکیان ئەوان لە قەراخ چۆمەکە دەبن، لە دووری هەموو نیگاکان دەست بە دەستبازیی دەکەن. دوای ئەوە، دایکم تووڕە دەبێت و تاشە بەردێک دەخاتە سەر سنگی باوکم و دەیبەستێتەوە و هەڵی دەداتە ناو ئاوەکەوە، بەڵام کەس نازانێت بۆ چی وای کردووە؟ بەتەنیا دێتەوە بۆ ماڵەوە. حەتمەن دانیشتووانی گوندەکە پێوەی دەنێن، بەڵام ئەگەر مرۆڤ پێیان باوەڕ بکات ئەوا نەدەبوو بەردەکە لەسەر سنگی لابەرن هەتا نەبوایە بە زاوا.

ئەگەرچی خانووەکەمان یەک قات بوو، بەڵام زۆر گەورە بوو. لە دوو بەش پێکهاتبوو، ئەو بەشەی خۆمان تێدا دەژیاین لەگەڵ تەویلەیەک. ئەو شوێنەی خۆمانی لێ دەژیاین لە هەیوانێک پێکهاتبوو کە دەکەوتە نێوەندی خانووەکەوە، ژێر زەمینێک و چوار ژووری نووستنی تێدابوو. دیوارەکانی لە بەرد دروستکرابوون، بە قوڕ سیواخ درابوون. براکانم، سلێمان و کامێر و مەمەد، ژنیان هێنابوو و منداڵیشیان هەبوو. هەر بۆیە هەتا دەهات ژمارەمان زۆرتر دەبوو، جێگاشمان تەنگتر دەبووەوە.

وەکو دوێنێ وایە لەبەر چاومدا. من لەگەڵ براکانم، موسا، داود و حوسێن و حەسەن عەلی، لە هەیوانەکەدا دەنووستین. دیارە حاڵمان زۆر باش نەبوو، بەڵام ژیان بەرەو پێشەوە دەچوو، خۆ هەر بەو حاڵەشەوە نەماینەوە.

بەهاتنی سەربازەکان بۆ ناوچەی دێرسیم، تا دەهات خەڵکەکە نیگەرانتر دەبوون. ژەنراڵێک فەرمانی دابوو

دراوسێیەکمان کە ناوی خدر بوو ببێت بە کوێخا، بۆیە دەبوو زوو زوو سەردانی گارنیسۆر، بکات. بەو شێوەیە هەواڵی شەڕەکانی دەوری(ڕووباری لاش)مان لە دێمانان بیست. هەواڵی کوشتنیماڵباتی سەید ڕەزاو، تەفروتوناکردنی پیاوەکانی بەختیاری، خزم و کەسوکار و دراوسێکانمان، سەربڕینی ئاغا شان، قیامەتی هەستاند بوو، ببوو بە وێردی سەر زمانی خەڵک و بەردەوام باسی لێوە دەکرا، هەموو گوندنشینەکانی هەژاند بوو. پیاوانی بە هەیبەتی وەکو سەید باکیل، کاک عەلی بەرتی و حوسێن باری، ئاگاداری هەموو شتێک بوون. ئەوان بە شێوەی جۆراوجۆر پەیوەندیان لەگەڵ پیاوانی بەدەستەڵاتی ناوچەکانی دێرسیمدا هەبوو.

بەو شێوەیە ڕۆژە ڕەشەکە هات. نیوەڕۆ بوو، خۆر بە بەرزییەوە لەسەر خانووەکەمان وەستابوو. ڕۆژێکی خەفەکراو بوو، گوێمان لە دەنگی سیسرکەکان دەبوو. سەگەکەمان، سیتچۆ، کە تووکێکی سپی و، دوو گوێی قوتی پێوە بوو، لەو سێبەرەی کە من یاریم تێدا دەکرد، لێی راکشابوو. تازە دایکم قژیی بۆ شانە کردبووم، مووروی سوور و شین و زەردی بە کەزییەکانمەوە کردبوو. لەپڕ گوێم لە سیتچۆ بوو دەستی بە وەڕین و هەڵبەزو دابەز کرد، زۆر نیگەران بووم، هەستامە سەر پێ. سەگەکە لە وەڕینی خۆی بەردەوام بوو، بەرەو لای ڕووبارەکە رایکرد، منیش دوای کەوتم. لەوێ، لەوبەر ڕووبارەکەوە چاوم بە حوسێن تووسکی و سەدان سەرباز کەوت، بە خۆیان و چەکەکانیانەوە، چەکەکانیان سەرەنێزەیان پێوە بوو. زۆربەی سەربازەکان پیادە بوون، بەڵام ئەفسەرەکان بە سواری ئەسپ و هێسترەوە بوون. بەرەو گوندەکەمان دەهاتن و

پیاوانی دەرلنگ فشی دێرسیمییان پێش خۆیان دابوو، پاڵیان پێوە دەنان. کە ئەوەم بینی تۆقیم، بەرەو ماڵەوە ڕامکرد، بینیم دایک و باوکم و براو براژنەکانم خەریک بوو دەهاتنە دەرەوە. ڕامکرد بۆ لای دایکم و خۆم کرد بەژێر کراسەکەیدا و دەستم بە گریان کرد.

سولێمان پیاوێکی پیر بوو، ڕووی کردە باوکم و پێی گوت: دەبێت تۆش لەگەڵمان بێیت.

باوکم خەریک بوو بۆی روون دەکردەوە کە بۆ لەگەڵیان نایەت:

- من ناتوانم ژن و منداڵاکان بۆ ئەو غەزەبانە بەجێبهێڵم، ئاخر من پیربووم، ئەوان هەقیان بەسەر منەوە چییە؟ ئێوە بڕۆن! خۆتان ڕزگار بکەن، من ئاگام لە ژن و منداڵەکان دەبێت.

حەسەن عەلی، کە لە هەمووان گەنجتر بوو لەگەڵ ئێمە مایەوە، بەڵام هەر شەش براکانی دیکەم، دوو لە براژنەکانم خۆیان کرد بە نێو دارستانی زارگۆڤیتەوە کە کەوتبووە پشت خانووەکەمانەوە. دراوسێکانیشمان، پیاوەکانی ماڵی ئیڤیش، کە بینیان چۆن ئەوانەی ئێمە ڕۆیشتن، ئەوانیش شوێنیان کەوتن. سەربازەکان گەیشتنە نێو ئاوایی، سەید باکلی، شەمۆی لای حوسێن توسکی و بەکۆی لای کاک عەلیش، هەموویان بەرەو دارستانەکە رۆیشتن. ئەوەی لە ئاواییدا مابووەوە، تەنها ژن و منداڵ و پیاوە پیرەکان بوون. دایکم دەستی کرد بە گریان، ئەو براژنانەشم کە مابوونەوە دەستیان کرد بە ڕنینەوەی قژی خۆیان، سەگەکەمان، سیتچۆ، هێشتا لای ڕووبارەکە بوو، بە بەردەوامی دەوەڕی. ئەوبەری ڕووبارەکەمان لێوە

دیاربوو. سەربازەکان چواردەوری خانووەکانیان گرتبوو، بۆئەوەی هەموو خەڵکەکە ناچاربکەن بێنە دەرەوە. گریان و شیوەنی ژنان و منداڵان دەگەیشتە لای ئێمە. ڕاستییەکەی، ئێمە نەماندەزانی چیمان لێ دەکەن. بەڵام لەوە تێگەیشتبووین کە دەیانەوێت هەموو پیاوەکان کۆبکەنەوەو و لەگەڵ خۆیان بیان بەن.

کاتێک سەربازەکان پەڕینەوە و بەرەو لای خانووەکەی ئێمە هاتن، باوکم وتی با بڕۆینە ژوورەوە، دایکم دەرگاکەی پێوەدا، ئێمەش هەموو خۆمان ترنجاندبووە لای پەنجەرەکەوە تا ببینین چی ڕوودەدات.

یەکە یەکە هەموو خانوەکانیان گەمارۆ دا، خەڵکەکەیان بە دەست بەرزکراوەیی بەزۆر دەهێنایە دەرەوە. بە ڕیز ڕوویان لە دیوارەکان دەکردن و دەستیان بە پشکینی خەڵکەکە دەکرد. پاشان کەوتنە پشکنینیماڵەکان.

بەوشێوەیە سەرە گەیشتە سەر ماڵی ئێمە. کە لە دەرگایان دا، باوکم دەرگاکەی کردەوە، بە خۆیان و تفەنگەکانی دەستیانەوە خۆیان کرد بەژووردا، بە زمانی خۆیان کە بۆ ئێمە بێگانە بوو و لێیان تێنەدەگەیشتین، دەستیانکرد بە هاوار هاوار بەسەرماندا. نەماندەزانی چیان لێمان دەوێت. باوکم گوتی، دەستان بخەنە سەر سەرتان و بڕۆنە دەرەوە. براژنەکەم منداڵاکانی کردە کۆڵی و دەستی گرت بە لەچکەکەی سەریەوە. لە دەرەوە هەموومانیان ڕیز کرد، ئەفسەرێک کە بەسواری ئەسپێکەوە بوو، فەرمانی بە سەربازەکان کرد، بمانپشکنن. کە هیچیان نەدۆزییەوە، جارێکیتر چوونەوە بۆ نێو خانووەکەمان. نیو سەعاتێکی پێچوو، تا هاتنە دەرەوە،

دەستیان بە پرسیارکردن لە باوکم کرد، ئەویش واقی ورمابوو و نەیدەزانی وەڵامیان بداتەوە، ئاخر ئەو لە زمانی تورکی نەدەگەیشت. وەرگێڕێکیان هێنا، لە باوکمیان پرسی کوڕەکانت لە کوێن؟ باوکیشم لە وەڵامدا گوتی: نازانم. ئیتر دەستیان بە لێدانی باوکم کرد، تا سوارێک هاتوو، دەستی گرتن. دوای ئەوە دەستی باوکمیان گرت و لەگەڵ خۆیان بردیان. ویستم دوای باوکم بکەوم، ئەوەندەمزانی دایکم قژی گرتم و وەستاندمی، نەیهێشت شوێنیان بکەوم. لە خانووەکەمان دوور کەوتینەوە تا لە چاومان ون نەبن، پیاوەکانیان لەگەڵ خۆیان بەرەو لای خانووەکەی باکیل برد. دایکم دەستی بەلاواندنەوە کرد، یەکە یەکە ناوی ئەو پیاوانەی دەگوت کە سەربازەکان لەگەڵ خۆیان بردبوونیان: مستەفایا دەروێش، داڤوتا قەر و حوسێن باری، هەروەها سلویا گولوری و خیدە کاک، کە بە ڕێکەوت لەناو دێکەدا بوون. سەربازەکان پیاوەکانیان بەرە و لای زێی(OKH) وە دەبرد تا لەگەڵ پیاوەکانی دێکانی دەورو پشتماندا، کۆیان بکەنەوە و لێیاندا و ڕۆیشتن.

کە گەڕاینەوە بۆماڵەوە چیمان بینی، هەموو شتەکانمان بەسەر یەکدا درابوو، دایکم دەستی بە دوعا کردن لە سەربازەکان کرد: دەک ڕەبی دەست و قاچتان بشکێ! یاخوا ماڵتان ئاگری تێبەربێ! بەر نەفرەتی ڕۆژ و دوزگوون بابا کەون کە ئێمە بە پشت و پەنای خۆمانیان دەزانین.

هەرچی ئاردمان هەبوو هەموویان هەڵڕشتبوو، گوێنیەکانیان هەڵدڕی بوو و لە هەیوانەکدا هەڵیان ڕشتبوون. هیزە ڕۆنەکانی دایکمیان هەڵدڕیی بوو، ڕۆنەکەیان کردبوو

بەسەر ئاردەکەدا. هەروەها فەردە سیر و پیڤازەکانیشیان دڕاندبوو بەسەر دۆشەکەکاندا هەڵیانڕشتبوون، هەرچی جلێکمان هەبوو هەموویان بەو ناوەدا بڵاوکردبووەوە، قاپ و قاچاخەکانیان شکاندبوو. کاتێک دایکم و براژنەکانم ماڵەکەیان بەو شێوەیە بینی، دەستیان بە گریان کرد، ئێمەی منداڵیش بەدوای ئەواندا دەستمان بە گریان کرد. دوای تاوێک دایکم داوای لە براژنەکانم کرد کە فرمێسکەکانیان بسڕن و بێن یارمەتی بدەن تا شتەکان کۆبکەنەوە. بەدەم کۆکردنەوەی ماڵەکەوە بە بەردەوامی دایکم دوعای لە سەربازەکان دەکرد. کە ماڵەکەمان کۆکردوە ئێمەش چووین بۆ لای ئەو خەڵکەی کە لای ماڵی سەید باکیلس کۆبووبوونەوە.

هەموو ژنانی ئاوایی لەوێ بوون. بەسێر خاتوون کە ژنی سەید باکیل بوو گوتی: سەربازەکان بەدوای چەکدا دەگەڕان، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ پیاوەکانمان دەکەن بەریان دەدەن. بەڵام ژنەکەی دۆیا قەر، یەکە یەکە ئەوانەی دەژمارد کە لە هێرشەکانی پێشووتردا لەگەڵ خۆیان بردبوونیان. چەکێ کە ژنی حوسێن باری بوو قسەکەی لەدەم وەرگرتەوە: ئەوانەی ئێمە ساڵێک دەبێت چەکیان داناوە، کەس لەم دێیەی ئێمەدا هیچ بەربەرەکانیەکی لەگەڵ سەربازەکاندا نەکردووە، کەواتە نابێت ئێمە خۆمان وەکو باڵندەیەکی بەدبەخت نیشان بدەین، خەمتان نەبێت پیاوەکانمان دەگەڕێنەوە. بەڵام ئەم قسانەی چەکێ وایان نەکرد کە قەناعەت بە هاسیل بابا کوڕی سەید باکلی بکات کە سەرەڕای ئەوەی تەمەنی نۆزدە ساڵ بوو سەربازەکان لەگەڵ خۆیان نەیانبردبوو، ئاخر ئەو قاچێکی ئیفلیج بوو. ئەو پێی وابوو کە چەکێ عەقڵی منداڵانەیە:

- دیارە پیاوەکانی بەختیاری، چەکیان هەڵگرتبوو، بەڵام ئەی بۆ ژن و منداڵەکانیان کوشتن؟ خۆ ئەوە ئەگەر هەر باسی کۆمەڵکوژییەکەی ماڵی سەید ڕەزا نەکەین، کە چل کەسی بێ چەک و بێتاوان بوون؟

ژنەکەی موختار تێڕوانینێکی دیکەی بۆ مەسەلەکە هەبوو:

- ئێمە نابێت پیاوەکانی خۆمان لەگەڵ سەید ڕەزا تێکەڵ بکەین؟ ئەو بەربەرەکانێی سەربازەکانی دەکرد. هەمووی خەتای ئەو بوو کە سوپا ڕووی کردە دێرسیم.

ئەم قسانە وای کرد کە چەکێ بە ڕووی ژنەکەی موختاردا هەڵشاخێ:

- کچێ لە خوا بترسە! ئا بەو شێوەیە باسی سەید ڕەزا نەکەی! ئەو هەموو خزمەکانی خۆی کرد بە قوربانی دێرسیم.

بەسەر خاتوون، تێکەڵاوی قسەکانییان بوو:

- ئێستا بڕوانن! بۆ لەگەڵ یەکتری شەڕ دەکەن. کەمێک سەبرتان هەبێت. ئێمە دەبێت تەنها لە خودا بپاڕێینەوە.

کە هەموو شت هێور بووەوە هاتینەوە بۆ ماڵەوە. هێشتا تاریک دانەهاتبوو، خۆر ئاوا نەبووبوو. دایکم باسی ئەوەی بۆ براژنەکانم دەکرد کە لە یەکێک لە گوندنشینەکانی بیستبوو، لەناکاو لە دەرگا درا، ترس دایگرتین، دایکم بە دوودڵییەوە دەرگاکەی کردوە. عەلی ئامۆزام بوو. ئەو بەشێوەیەکی وا سەیر خۆی کرد بەژووردا، دایکم ملی گرت و دای لەپرمەی گریان. بە شەلە شەل، چوو لەسەر تەختەخەوێک دانیشت، ئێمەش لەسەرخۆ دەورەمان دا، هێشتا خوێن لە مل و

قاچەکانی دەچۆڕا، وەڵامی پرسیاری دایکمی بۆ نەدەدرایەوە. لەو کاتەی کە دایکم خەریکی ئامادەکردنی تەشتێک ئاوی گەرم بوو، ئەویش هێواش هێواش زمانی هاتەوە گۆ:

- کاتێک گەیشتینە سەر ڕووبارەکە کە سەربازەکان چواردەوریان گرتبوو، ئێمەیان پێش خۆیاندا بەرەو لای

(OKH)، من شتێکم کرد کە تەواو کارێکی شێتانە بوو، وەک ئەوەی بەدەستی خۆم ملم بخەمە بەردەستی جەلادەکەم. چەند وشەیەکم بە تورکی گوت، گوتم بەڵکو ئەگەر وا بزانن کە زمانەکیان دەزانم، ڕزگارمم ببێت لەدەستیان. چوومە پێشەوە بۆلای ئەفسەرێک و پێم گوت کە من بێ تاوانم و لێی پاڕامەوە ئازادم بکەن.

- بەڵام لە وەڵامدا گوتی: «هەی فێڵباز، باشە کە تورکی دەزانیت بۆ لە ئێمەت شاردۆتەوە». فەرمانی بە سەربازەکانی دا، بمدەن بەزەویدا و بە جەیزەرانەکانیان بەربوونە گیانم، بێ پسانەوە لێیان دەپرسیم کە کێ چەکی هەیە، منیش سوێندم بۆ دەخواردن کە کەس چەکی نییە. دوایی یەکێکیان لەسەر سنگم دانیشت و دوانی تر قاچەکانیان بەرزکردمەوە و هەردوو قۆڵیان گرتم و کەوتنە لێدانی پێیەکانم.

هەر لەیەکەم تێسرەواندنیان وام هەست دەکرد کە ماسوولکەکانم بە تەواوەتی سڕ بوون، وام هەست دەکرد دەڵێی جەرگ و دڵم دەردەهێنن، خوێن لە قاچەکانمەوە فیچقەیان کرد. ئیتر دوای ئەوە نەمتوانی پیاکێشانەکانیان بژمێرم.

- کاتێک بەهۆش خۆم هاتمەوە، خۆم بەتەنیا بینییەوە. بیرمکردەوە کە ئەگەر بە گاگۆلکێش بێت خۆم بگەیەنمەوە ماڵەوە. لەپڕ گوێم لە دەنگێک بوو دەینالاند. هەرچۆنێک بوو خۆم گەیاندە ئەو جێگایەی کە دەنگەکەی لێوە دەهات. کە بینیم ئەوا (Khide kek) لەسەر پشت کەوتووە و هەمووە دەمووچاوی خوێنە. هەستم کرد هێشتا گیانی تێدا ماوە. بەلام من خۆم نەمدەتوانی بەرێگادا بڕۆم، چ جای ئەوەی ئەویش هەڵبگرم. کاتێک عەلی لە قسەکانی بووەوە، دایکم بە هێواشی بە ئاوی شیلەتێن قاچەکانی بۆ داشت. دوای ئەوە یەکسەر چوو بۆ ماڵی (Khide kek) تا هەواڵەکەیان پێ رابگەیەنێت. ژنان بەرەو ڕووبارەکە ڕایانکرد تا بریندارەکە بهێننەوە، عەلی ئامۆزاشم سەرەڕای برینەکانی قاچی بەرەوە چیای زارگۆڤیت کەوتە ڕێگا.

## ٢

سەربازەکان، عەلی ئامۆزامیان بەجێ هێشتبوو، وەکو ئەوەی کە مردبێت. پیاوەکانی تریان پێش خۆیان دابووە بەرەوە (Okh). سەربازەکان بە قۆناخە تفەنگ بەر ببوونە گیانی پیاوەکان کە زۆربەیان بە ساڵاچوو بوون. کاتێکیش لە هیلاکی، برسێتی و تینوێتیدا بەم لاو بەو لادا دەکەوتن، بە حەیزەران تێیان دەکەوتن و بەزۆر هەڵیاندەستاندنەوە، هەروەها ڕێگایان نەدەدا کە کاروباری سەرئاویان جێبەجێ بکەن. گەیشتبوونە گوندی (Okh)، هەمانشتیان دووبارە کردبووە کە بەسەر گوندی گالبووسانیاندا هێنابوو، چواردەوری خانووەکانیان گرتبوو، ژن ومندال و پیرەمێردەکانیان هێنابووە دەرەوە، پیاوەکانیان تێکەڵ بە ڕیزەکە کردبووە، دوایی بەرەوە گوندی سیتریچ کەوتبوونە ڕێگا.

ڕووباری بە خوڕیی(Okh)، دڕی بە دۆڵەکە دەدا. کێڵگەکانی دامێنی چیای سپیی، کردبوو بە بەردەلان و لاشیو. بۆ دوا جار بە هێزی بازوو بەوپەڕی بێ ڕێزیی و بە لێدان، پیاوەکانیان ناچار کردبوو کە بەرەوە گوندی سرتێچ

هەڵگەڕێن، پیاوەکانی ئەویشیان تێکەڵ بە ڕیزەکە کردبوو. بۆ لای ئێوارە گەیشتبوونە

خەتەش. خەتەش کەوتۆتە نزیک لووتکەی چیای سپی و بە دارگوێز و میوەهاتەکانی بەناوبانگە. لەوێ پیاوەکانیان ناچارکردبوو بمێننەوە و سەربازەکانیش فەرمانیان پێدرابوو کە گوندەکە بە دیقەت بپشکنن. پیاوەکانی ئەویشیان کۆکردبووەوە، بە گۆچان تێیان کەوتبوون و هێنابوونیان بۆ لای ئەوانی دیکە. کاتێک خۆر ئاوا دەبێت، سەربازەکان هەندێک خواردنیان ئامادە کردبوو، پێش ئەوەی دەست بە خواردن بکەن، دیلەکان داوای خواردنیان کردبوو، کەمێک پەنیر و ڕۆن و نانیان دابوونێ، دەبوو پێی ڕازی بن.

لە نێو دیلەکاندا، منداڵێکی تێدابوو کە ناوی سەلمان بوو، تەمەنی دوانزدە ساڵان بوو و کوڕی کالۆی سەرۆک عەشیرەتی، خێڵی محەمەد بوو. باوکی سەلمان، پیاوێکی دنیا دیدە و بیرتیژ بوو. بە پێچەوانەی پیاوە خۆش باوەڕەکانی گوندەکەوە، ئەو دەیزانی کە سەربازەکان خەریکی خۆ ئامادەکردنن بۆ ئەوەی کارەساتێکیان بەسەردا بێنن. نەیدەتوانی وەکو ئەوانی دیکە چاوەکانی لێک بنێت. دوای ئەو شتەی کە ناویان لێنابوو خواردنی ئێوارە، سەربازەکان فەرمانیان پێ کردبوون کە نابێت لەگەڵ یەکتری قسە بکەن، پاشان بردبوونیان بۆ شوێنێکی بەرئاوالا. لەوێ سێ ئاگری گەورەیان کردبووەوە بۆئەوەی چوار دەوریان ڕووناک بکاتەوە. لە شەودا، کالۆ دەستی هێنا بەسەر کوڕەکەیدا، تەنیا یەک شتی لە مێشکدا بوو ئەویش ڕاکردن بوو، بەڵام هیچ هەلێکی بۆ نەڕەخسا.

بەیانی زوو دیسان کاروانەکە بەڕێ دەکەوێتەوە. لەسەرەوە، لەسەر لووتکەی چیایی سپی، دەنگی گریان و لاواندنەوەی ژنەکان دەبیسترا.

گەیشتنە ئەو جێگایەی کەوا ڕێگای سەربازی تێدا دروست دەکرا. وەکو شوێنێکی کرێکاری چاوی لێ دەکرا، خێمەیەکی لێ بوو پیاوێک بەناوی بەکۆ چاودێری دەکرد. بۆیە(بەکۆ)یان لەوێ دانابوو، چونکە کەمێک زمانی تورکی دەزانی. ئەو جگە لەوەی کە سەر بەهەمان عەشیرەتی کالۆ بوو، هەروەها دراوسێشیان بوو.

هەر لەو کاتەوەی کە گوندی خەتشی بەجێ هێشتبوو، کالۆ لە دووزگوون بابا دەپاڕایەوە کە بەلای ئەو خێمەیەدا ڕەت ببن. هەر دەیڕوانی، لە کۆتایدا خێمەکەی بەرچاو کەوت. بیری دەکردەوە، دوعاکانی قبول بوون. دەستی منداڵەکەی گرت و خۆی خستە دوای ریزەکەوە، کڵاوە سوورەکەی لەسەری منداڵەکەی لابرلابرد، فانیلەکەی لەبەر داکەند، کەمێک سەرو قژیی بۆ ڕێکخست و بە گوێیدا چرپاند:

- کوڕی خۆم، کە گەیشتینە بەردەم خێمەکە پاڵێکت پێوە دەنێم و یەکسەر خۆت دەکەیت بە نێو خێمەکەدا. مامە بەکۆ لەگەڵ خۆی هەرچی زووترە دەتباتەوە بۆ لای دایکت. نەترسیت، ئەگەر سەربازێکیش لێی پرسیت تۆ کێی، بڵێ من کوڕی بەکۆم.

کاتێک گەیشتنە بەردەم خێمەکە، سەیرێکی ئەم لاو لای خۆی کرد تا بزانێت کەس سەیریان ناکات، پاڵێکی بە کوڕەکەیەوە نا بۆ لای بەکۆ کە لەبەردەم خێمەکەدا وەستابوو. بەکۆش بە خێرایی پانتۆڵەکەی لەبەر داکەند و خاولییەکی

تێوە پێچاو لە تەنیشت خۆیەوە داینا. هەردووکیان دەترسان و بەکۆ دەستەکانی وەک شەق شەقە دەلەرزی.

لە پڕ ئەفسەرێک لە ڕیزەکەی ئەو بەرەوە پەیدابوو، هێسترەکەی لەبەردەم خێمەکەدا وەستاند. بەکۆ هاتە دەرەوە. پیاوێکی درێژ، لوتێکی هەڵۆیانە و سمێلێکی درێژی ئەستووری هەبوو. ئەفسەرەکە زۆر بە جددی سەیرێکی کرد، سەیرێکی کوڕەکەی کردو بە بەکۆی وت وەرە پێشەوە. بەکۆ ویستی غیرەت بداتە بەرخۆی و سێ هەنگاو هاتە پێشەوە، سڵاوێکی سەربازیانەی لێکرد و پێڵاوەکانی هەڵکێشاو، ناوی خۆی گوت:

- بەکۆ، حەرەسی جادە سەربازییەکەم، گەورەم.

ئەفسەرەکە بە چاوێکی گوماناوییەوە لە منداڵەکەی ڕوانی و پرسیاری لێ کرد:

- ئەو منداڵە هی تۆیە؟

بەکۆ بە جارێک تۆقی بوو، بەڵام دیسانیش وەڵامی دایەوە:

- ئەگەر بە کۆیلەی خۆتانی قبوڵ بکەیت، گەورەم، بەڵێ کوڕی خۆمە.

ئەفسەرەکە درێژەی پێداو گوتی:

- بەڵام ئەمە لە تۆ ناچێت.

بەکۆ وای نیشاندا کە گاڵتەی لەگەڵ دەکات:

- ئەم سەر دایکی داوەتەوە، گەورەم!

ئەفسەکە کەمێک بیری کردەوە و بەبێ ئەوەی هیچی تر بڵێت، پاش تاوێک بە خێرایی سواری هێسترەکەی بووەوە و شوێن ئەوانی دیکە کەوت. خۆی گەیاندە قافڵەکەیان کە بەرەو شاخی سپی رێچکەیان گرتبوو. سەر شاخەکە، جێگایەکی پان و بەرین و دامێنەکەشی لا شیوەڵان بوو. لەوێوە گوندی ئەباسیان و زمێک دەبینران. دەتگوت خانووەکان بەقەد شاخەکەدا بەرش و بڵاو بوونەتەوە. دووکەڵ لە کڵاوڕۆژنەکانەوە بەرز دەبووەوە و سەدەها ناڵەو هاوار لە نێو لووتکەکاندا، دەنگی دەدایەوە.

هەر لەودەمەی قافڵەکە بە شاخەکەدا هەڵدەزنا، کالۆ، لە هەوڵی ئەوەدا بوو دیلەکان ڕازی بکات خۆیان دەرباز بکەن.

- بە چپە پێی گوتن، ئاگاداربن، سەربازەکان نیازیان هەیە بمانکوژن. لەم دۆڵەدا دەتوانین خۆمان ڕزگار بکەین، ئاخر دەبینن کە چۆن سەربازەکان لە هیلاکیدا کەنەفت بوون. ئەمە ئەو چرکەساتانەیە کە چاوەڕوانی دەکەین، وەرن با ڕاکەین.

بەڵام کەس گوێی بە قسەکانی نەدا، ئاخر هەموو بڕوای تەواویان وابوو:

- کورە دەبەسیەتی! هیچمان لێ ناکەن، قەیرێکی تر هەموومان بەردەدەن. بەڵام ئەگەر ڕاکەین، ئەوا نیشانی دەدەین کە تاوانبارین.

گومان مێشکی پڕکردبوو، بەناچاری دوای هاوڕێکانی کەوت. دوای ئەوەی بەسەر هەندێک تاشە بەردا سەرکەوتن، هێندەیان نەمابوو بگەنە سەر لووتکەی شاخی سپی.

ئەفسەرەکان کە بە سواری هێسترەوە بوون، بۆ جێگایەکی پەنا دەگەڕان کە دیلەکانی تێدا کۆبکەنەوە.

- کالۆ، بە ئەسپایی بەوانەی لە نزیکییەوە بوون گوت: ئەوەتا بەدوای شوێنێکدا دەگەڕێن کە بیکەن بە گۆڕی ئێمە.

بەڵام کەس نەیدەوست بڕوا بە قسەکانی بکات. دواجار، سەربازەکان شوێنێکی لا چەپیان هەڵبژارد کە دەکەوتە سەرووی دۆڵی زمێنک، دیلەکانیان ڕاپێچی ئەو شوێنە کرد. گەرمای مانگی ئۆگۆستی، هەراسانی کردبوون، تیشکی خۆر کەللەی سەریانی دەکولاند. تاشە بەردەکانیش وەکو ساجی سوورەوەبوویان لێهاتبوو. بۆ ئەوەی لەوەش زیاتر عەزاب بچێژن، سەربازەکان بە بەردەوامی ڕووی تفەنگەکانیان ئاراستەی دیلەکان دەکرد، ئەوە جگە لەوەی یەک دڵۆپ ئاویان نەدەدانێ.

لاشەکانیان لە سیپاڵکێک دەچوو کە لەبەر تیشکی بەهێزی خۆر بەسەر تاشەبەردەکاندا هەڵخرابێت. بە دەنگێکی نزم لەگەڵ یەک قسەیان دەکرد، تا ئەگەر شتێکی نوێ هەبێت، ئاگادرابن لێی.

سەید هۆس، کە کوڕی ماما ئاغا بوو، خۆی چەماندبووەوە بەلای زاواکەیاندا، دۆیۆ قەر، بەرانبەری دانیشتبوو، خەڵکی گوندی گالبووسان بوو. دۆیۆ سڵاوەکەی لێسەندەوە:

- ئەوە چییە، سەید هۆس، برینداری؟

سەید هۆس، دەستی بە گێڕانەوەی ئەو کارەساتە کرد کە بەسەریاندا هێنابوو:

- هەر لە بنکەی سەرەکی سەربازگەی توریشمێکەوە، دەستیان بە لێدانمان کرد. سێ ڕۆژ پێش ئێستا لە ڕێگای نوێنەری والییەوە بانگیان کردین بۆ سەربازگەی مامکی. دەستمانیان بەستەوە و بردینیان بۆ تورشمەک. چەند سەد کەسێک دەبووین، هەموومانیان کردە تەویلە و کادێنەکانەوە. لەوە دەترساین کە بەدەردی ئەرمەنییەکانمان بەرن کە هەر بە زیندووی سوتاندنیان، بۆیە لەنێو خۆماندا کردمان بە دەمەقاڵە. ئەوە بوو دەرگاکەیان لێ کردینەوە، ئەفسەرێکی قژ زەرد کە لە گایەک دەچوو، ڕووبەڕومان بووەوە. غەزەب لە چاوی دەباری. دەستی کرد بە جنێودان پێمان. عەلی ئاغای خەڵکی تچرتیک وەکو شێر لێی ڕاپەڕی و ڕووی کردە ئەفسەرەکە و بە زمانێکی تورکی ڕەوان پێی گوت: "ئەرێ پێمان ناڵێیت ئێمە چیمان کردووە؟ بۆ بەو شێوە ناشیرینە هەڵسووکەوتمان لەگەڵدا دەکەن؟

ئەفسەرەکە سەیرێکی کردوو پێی گوت "لاچۆ لەبەر چاوم"، دوای ئەوە ڕێگای دا بڕواتەوە بۆماڵەوە. پاشان ڕووی کردە ئێمە کە لەبەردەم دەرگاکەدا وەستابووین. لە کەسێکی کە لە نزیکییەوە وەستابوو پرسی ناوت چییە؟ وەڵامی دایەوە: مام حوسێن. پاشان لە منی پرسی ئەی تۆ ناوت چییە؟ منیش لە وەڵامدا گوتم سەید حوسێن. بە وەڵامەکەی من زۆر توورەبوو:

"بەخوا جوانە"؟ نازانم بۆ پێشتر هەڵمانەواسین و نەمانسووتان؟ لە دەست ئەم هەموو سەید و حوسێنانە، ڕزگارمان نابێت؟ بە تووڕەییەوە لە تەویلەکە هێنایینیانە دەرەوە

و دەرگاکەیان داخستەوە، دەستیان کرد بە لێدانمان. ژمارەیەک سەربازیان تێبەردایین، بە قامچی کەوتنە لێدانی بەری پێمان، پاشان وەکو مەیت کردینیانەوە بە نێو گەورەکەدا.

چونکە نەمدەتوانی برۆم، سواری هێستریکیان کردم، ئەوە بوو کە گەیشتینە گوندی کەچ، تێکەڵ بە ئێوەیان کردین. ئینجا زاواکەی دەستی بە گێرانەوەی بەسەرهاتی خۆی کرد. لە تەنیشت ئەوانەوە سێ گەنج دانیشتبوون و سەریان نابوو بەسەری یەکەوە، بە چپە قسەیان دەکرد. یەکێکیان عەلی باقیا دلی بوو لە (پەخێ هاڤکی) گرتبوویان و هێنابوویان بۆ گالبووسان. کوڕێکی ڕەشتاڵەی شان و مل قەوی بەخۆوەوە بوو. بە پێچەوانەی ئەوەوە، حوسێن عەلی خەلیف کە خەڵکی گوندێکی جیرانیان بوو، لاواز ، بالایەکی مامناوەندی، قژێکی خورمایی هەبوو، بە گوێرەی تەمەنی خۆی کامڵ بوو بەڵام شەرمن بوو. ئەوەی تریان (واوێلە عەلی خدجی)، سەر بە بنەماڵەیەکی هەژار بوو، کورتە بالا و قەڵەویچکە بوو، ژنی هێنابوو خاوەنی چوار منداڵ بوو.

## ٣

چیایی زارگۆڤیت، ڕۆحی ئێمە و، پارێزەر و پەناگامان بوو. خەڵکی ئەو گوندانەی کە لە ژێر باڵەکانی ئەو چیایەدا دەپارێزران، خەڵکێکی بەدبەخت بەڵام شۆرشگێر بوون، هەر بۆیە لە لایەن تورانییەکانەوە دەچەوسێنرانەوە، ژیانێکی سەختیان هەبوو. چیایی زارگۆڤیت لە دایکێک دەچوو کە هەمان هەستی بەرانبەر منداڵەکانی خۆی هەیە و، بەیەک چاو سەیری هەمویان دەکات. بە دار و گژوگیا، لووتکەکانی پەناگایەکەکیان دروست کردبوو. با و بۆرانەکەشی بەهەمان شێوە پێشوازی لە گیاندارەکانی دەکرد، نرخ و بەهاو تایبەتمەندییەکانی ئەوانی دەزانی و دەیپاراستن. کەچی ببووە مۆتەکەیەک بەسەر سەریی چەوسێنەرانەوە.

ئێمەی ژن و منداڵ کە لە گوندەکەمان، گالبووسان، مابووینەوە، خۆمان سپاردبووە دەست خودا و دووزگوون بابا و زارگوڤیت. تەنها بڕوامان بەوان دەکرد، بۆیە بێ پسانەوە لە هەرسێکیان دەپاڕاینەوە.

ئێستا کە باوکم گیرابوو، براکانم خۆیان شاردبووەوە، شتێکی وا لە ماڵەکەماند نەمابوو. شەو و ڕۆژمان لا

بووبوو بە یەک. بە حەسرەتەوە گوێمان بۆ دەرگای دەرەوە هەڵدەخست، دڵمان لەگەڵ چرپەی دارەکاندا لێی دەدا، بەڵام حەزو ئارەزووەکانمان تەنها تا سەر لووتکەی چیاکان بڕی دەکرد. هەر کە گوێمان لە وەڕینی سەگێک بوایە، خورپەیەک بە دڵماندا دەهات، رامان دەکردە دەرەوە تا بزانین چی روویداوە. بەبێ ئەوەی تەزوویەکی خۆشی بە دڵماندا بێت، دەهاتینەوە ژوورەوە، بەو شێوەیە شەو ڕۆژمان بەسەر دەبرد.

شەوێکیان کە هەموومان خەوتبووین، نیوەشەو بوو، سەگەکەمان سیتچۆ چوار پێنج جارێک لەسەر یەک حەپاندیی. کە سەگەکە بێدەنگ بوو، دایکم هەستاو فانۆزێکی داگیرساند. کە سیتچۆ بێدەنگ بوو، هیوایەکەمان لا پەیدا بوو. هەمان کات کەسێک لە دەرگای دا، دایکم بەرەو لای دەرگاکە چوو، کردییەوە. هەموومان بە دڵە کوتێ لە خەو ڕاپەڕین. ئەوەی کە لەدەرگای دا، سلێمان بوو. ئەو عادەتی وابوو لای باپیرەم کە ئەو پێی دەگوت ماما ئاغا، بمێنێتەوە. کوڕێکی تەمەن بیست و دوو ساڵەی، باریکەلە، باڵا مامناوەندی، دەم بەخەندە و بیرتیژو، فێلباز بوو. دەستی دایکمی ماچ کرد، پرسیاری ئەوەی لە براژنەکەم کرد کە چی تازە دەزانێت و ئێمەی منداڵی لە ئامێزی خۆی گرت.

بەبێ ئەوەی قەیتانی پێڵاوەکانی بکاتەوە، یەکسەر نیازی دڵی خۆی بۆ کردینەوە:

- من لەسەر چیایی زارگۆڤیتەوە هاتووم، هیچ خۆتان نیگەران مەکەن. هەموو خزمەکانی ئێوە و پیاوەکانی دێهاتەکانی ناوچەکە و ژن و منداڵەکان، لە گرووپی نزیکەی

سەد کەسیدا یەکیان گرتووە، لە نێو دارستانەکاندا خۆیان شاردۆتەوە. ئەوەی کە ئەوان پێویستیانە، نان و ئاوە. من بۆ ئەوە هاتووم، پێش ئەوەی بەیانی ئێوارەکەی بگەڕێمەوە بۆ لای ماما ئاغا، هەندێک پێداویستی پەیدا بکەم. دوو کەس کاریان ئەوەیە خواردن بۆ ئەوانەی ناچار کراون ڕابکەن، پەیدا بکەن.

کوڕەکانت و خزم و کەسوکارتان بەگەرمی هەواڵیان دەپرسین. هەموتان لە ئامێز دەگرن و داوایان لە ئێوە ئەوەیە کە لەبەر خاتری ئەوان خۆتان ناڕەحەت مەکەن. دایکم خۆشحاڵی خۆی بۆ دەربڕی:

- دەبێت خێرێکت بۆ قەرار بدەم، ئەمەی بە گەرمییەوە پێ گوت.

دوای ئەوە هەستایەوە و دەستی بە خۆئامادەکردن کرد. لەو کاتەی براژنەکانم ئاگریان کردەوە، ساجیان خستە سەر ئاگردانەکە، دایکیشم دەستی بە هەویر شێلان کرد. کە تەواو بوو، نان و ڕۆنەکەرە و پەنیری خۆماڵی لە لایەکی کۆڵەپشتێکدا پێچایەوە، لایەکەی دیکەیش دۆی تێکرد. براژنەکانم لە کانییەکەی خۆمان کوندەیەکیان پڕ لە ئاو کرد، سلێمان نەیدەویست کات بەفیڕۆ بدات، منداڵەکانی لە ئامێز گرت و دەستی دایکمی ماچ کرد، کۆڵەکەی هەڵگرت و لێیدا ڕۆیشت.

هەر کە دەرگاکە پێوەدرا، براژنەکانم دەستیان بە نووکە نووک کرد، ئەوەش هۆکارێک بوو بۆ تووڕەبوونی دایکم:

- ئەوە بۆ وا لە خۆتان دەکەن؟ شوکور هەموو ساخ و سەلامەتن.

پاش تۆزێک ڕووم کردە دایکم و لێی پاڕامەوە کە دەمەوێت لە حاڵ و ئەحواڵی باوکم شتێک بزانم و دەبێت وەزعی چۆن بێت؟

- ئەی بۆ نەختێک نانیش بۆ باوکم نانێریت؟ دەبێت مشوورێکی نانەکەی ئەویش بخۆیت؟ ئەی سلێمان نەختیک لەو نانەی کە بردی لەگەڵ خۆی نادات بە باوکم؟ باوکم حەزی لە دۆ خواردنەوەیە، وانییە؟ کە دایکم گوێی لە قسەکانی من بوو بەو شێوەیە، دەستی بە پرمەی گریان کرد ئەمجارەیان نۆرەی براژنەکانم بوو دڵنەوایی دایکم بدەنەوە، فرمێسکەکانی سڕیی و دەستی بەلاوانەوە کرد:

دڵ شکاوم، دەستەکانم ئیفلیج بوون.

مێردەکەم بێ سەروشوێن و کوڕەکانیشم چوونەتە سەر چیا،

بووکەکانم خەفەتبارن و چاوەکانم پڕن لە فرمێسک،

دوگووز بابا، قسەیەک ناکات، تورانییەکانیش خۆێنیان لێمان دەوێت.

خەو ناچێتە چاوەکانم،

خەو بە منداڵەکانمەوە دەبینم،

دەترسم و، تۆرانییەکانیش وەکو خەنجەرێک لە دڵم چەقیوون.

## ٤

ئەو دێیەیی باپیرەم، ماما ئاغای لێ دەژیا، بەپێی سەعاتە ڕێیەک لە گالبووسانەوە دوور بوو. دارستانێکی چڕ لای سەرووی دێکەی داگیر کردبوو، لە دامێنیشەوە دەشتی پیرگرد لێی راکشابوو. خانووکەی باپیرەم یەک نهۆم بوو، دیوارەکانی بە بەردی سپی گەورە هەڵچنرابوون، هەیوانێک و تەویلەیەکیشی بەدەمەوە بوو. کوخ و تەویلەکەی حەسەن، لە خوار ماڵی باپیرەمەوە بوو. دێیەکە هەر ئەوەندە بوو. باپیرەم و مامەکانم و حوسێن و حەسەن لەوێ دەژیان. لە نێو خانووەکەدا تەنها ژوورێکی چوارگۆشەیی هەبوو، کە دەچویتە ژوورەوە لە ناوەڕاستیدا خۆت دەبینییەوە، لە لای چەپەوە ئاگردانێکی سەرکراوە و دیوانێکی لێبوو. ژوورەکە بە دوو دیواری بچوک کرابوو بە دوو بەشەوە، فەرشێکی کلیمیان پێدا هەڵواسیی بوو، دەوری پەردەیەکی دەبینی. بەشەکەی دیکەی ژوورەکە وەکو چێشتخانە و عەمارێک بۆ نان و نوێنەکان، بەکاردەهێنرا. کاتێک میوانیان دەبوو، ژن و منداڵەکان دەچونە ئەو ژوورەوە، بە زستانان لە ئاگردانە کراوەکەی دیکەیاندا ئاگرمان دەکردەوە.

ماما ئاغا، بەلایەنی کەمەوە تەمەنی سەد ساڵێک دەبوو، ژیانێکی ساکار بەڵام خۆشی ڕابوارد بوو. هەمیشە جلێکی سپی لەبەرد دەکرد، پشتێنێکی گەورەی لە پشت دەبەست. بەردەوام بە جوانی ڕیشە سپییە درێژەکەی شانە دەکرد، بەبێ گۆچانەکەی بۆ هیچ کوێیەک نەدەچوو. ئەگەر بڕوا بە دایکم بکەم، دەیگوت باپیرەم دەیزانی چ خواردنێک بخوات، هەموو شتێکی بە ڕێکوپێکی ڕیکدەخست و لەژیانیدا دەستی بەر چەک نەکەوتبوو. هەموو ئەوانەی لە دەورووبەری بوون خوا خوایان بوو ئەو ڕێزیان لێ بگرێت، ئاخر لەوە دەترسان بەرنەفرەتی ئەو بکەون.

بەڵام ئەو زۆر لە کوڕە بچکۆلەکەی حەسەن تووڕە بوو، کەسێکی کوشتبوو، هەر لەبەرئەوەش بوو کە ڕێگای نەدەدا بێتە سەر سفرەیان. زۆر بەجدی بەدواداچوونی لەسەر ڕووداوەکانی دێرسیم دەکرد و کاتێکی زۆری خۆی پێوە تەرخان کردبوو. ماما ئاغا، دەیزانی کوڕەکەی واتە مامە حوسێن، لەلایەن پارێزگارەوە بانگ کراوە بۆ فەرماندەیی سوپا لە مامیک و سێ ڕۆژ دوای ئەوە بەرەوە شاخی زارگۆڤیتیان بردووە. کوڕەکەی دیکە واتە حەسەن ئەو هەواڵە ناخۆشەی پێ ڕاگەیاندبوو و پێی گوتبوو باشترە بڕوات:

- باوکە، واباشترە کە ژن و منداڵەکان لەگەڵ خۆت بەریت و بەرەو لووتکەی چیای شاخی سپی هەڵکشێن.

زۆری لەگەڵ گوتبوو بەڵام باپیرەم بەهیچ جۆرێک ئامادە نەبوو بەقسەی بکات. ئەو نەیدەویست گوێبیستی ئەو قسانە بێت بۆیە لە وەڵامدا گوتبووی:

- نامەوێت خۆم بشارمەوە، با لەسەر جێگاکەم بمکوژن. بۆیە مامە حەسەنم هیوا بڕاو ببوو لەوەی قەناعەتی پێبکات، بۆیە پەلی هەموو منداڵەکانی گرتبوو، بەرەوە شاخی سپی کەوتبوونە ڕێ، چەندیش خواردنیان بۆ هەڵگیرابوو لەگەڵ خۆیان بردبوویان.

بەو شێوەیە باپیرەم بەتەنها دەمێنیتەوە، بۆیە پەنا دەباتە بەر سلێمان وەکو کوڕێکی خۆی، بڕوا پێکراوی بوو. ئەو زیاتر لەگەڵ سلێماندا، هەڵسان و دانیشتنی هەبوو تا دوو کورەکەی خۆی کە هەریەکەیان لە شوێنێک دەژیان. بنەچەی سلێمان دەگەڕایەوە بۆ سەر خێزانێکی هەژار، باپیرەم پەروەردەی کردبوو. جوانترین جلی بۆ دەکڕی و کام خواردن خۆشبوایە دەیدایە، دەیویست هەتا بۆی بکرێت لە نزیک خۆیەوە بێت، پێی ڕاسپاردبوو دەنگوباسی گوندەکانی دەوروبەری بۆ بهێنێت.

سلێمان لە گالبووسانەوە، خواردنی دەبرد بۆ باپیرەم کە بەتەنیا لەو خانووەدا مابووەوە، هەروەها بۆ مامە حەسەن و ژن و منداڵەکانی کە ڕایانکردبوو بۆ نێو چیای سپی. پاشان وەکو سەگێکی تیژڕەو بە ڕێگا باریکەکاندا وندەبوو.

دایکم هەمیشە دەیگوت کە لە هەموو دێرسیمدا کەسێک نییە وەکو سلێمان ڕابکات و بگاتە جێگای مەبەست، ئەسپێک بە چوار ناڵە نەیدەتوانی سەعاتێک لەگەڵیدا ڕابکات یانیش کەروێشکێکی کێوی نەیدەتوانی لەدەستی هەڵبێت. باپیرەم تەئیدی قسەکەی دایکمی دەکرد و دەیگوت ڕاست دەکات، پاشان ئەوەشی لێ زیاد دەکرد کە چاوی لە چاوی گورگ تیژترە و لە سەگێکیش زیاتر بە هەسترە.

سوپا هەموو دێرسیمی داگیرکردبوو، بەڵام سلێمان لەم دێ بۆ ئەو دێ و لەم شاخ بۆ ئەو شاخ دەهاتوو دەچوو، تەنانەت یەکجاریش سوپا نەیتوانیی بوو دەستگیری بکات. چەندین جار کەمینیان بۆ نابووەوە، بەڵام هەموو جارێک خۆی دەرباز دەکرد، تەنانەت جارێکیان خۆی نیشانی یەکەیەکی سەربازیی دابوو، بەڵام وەک دوکەڵی جادوگەر چوو بوو بە ئاسماندا.

سلێمان وەکو تیسکەی تفەنگ، بەنێو دۆڵی عەلیا ئاغا و جەنگەڵەکانی شاخی سپیدا، تێی دەتەقاند. بە ڕێگایەکی باریکدا خۆی دزیبووەوە و لە گوندەکە خۆی نزیک کردبووەوە. سەیرێکی دەوروبەری ئاوایی کردبوو، کە زانیبووی هیچ لە گۆڕێ نییە، خۆی گەیاندبووە خانووەکەی باپیرەم. بە هەناسەبڕکێ، سێ جار لە دەرگای دابوو، ئاخر ئەوە نهێنی بەینی خۆیان بوو. ماما ئاغا کە دەزانێت ئەوە سلێمانە، خێرا لە نێو جێگاکەی هەڵدەستێتەوە و بەپەلە دەرگاکە دەکاتەوە.

هێشتا نە چووبونە ژوورەوە، دەستی باپیرەم ماچ دەکات، باپیرەم بێ پسانەوە دەست دەکات بە پرسیار کردن لێی؛

- سلێمان، کەسەکەم، ئەوە بەم ڕۆژی نیوەڕۆیە بۆ هاتووی بۆ ئێرە؟ خێرە، خۆ خەبەری ناخۆشت نەهێناوە؟
- یاخوا قەت خەبەری ناخۆشت پێ نەگات، سلێمان ئەوەی پێ گوتبوو و درێژەی بە قسەکانی دابوو:
- هەموو ساخ و سەلامەتن، بەگەرمی لە هەواڵت دەپرسن. هەر حەزم کرد سەرێکت لێ بدەم.
- ماما ئاغا فەرمووی لێکردبوو تا لەقەراخ قەرەوێڵەکەی لەلایەوە دابنیشێ و نیگەرانی خۆی نیشاندابوو:

- ناتوانم حەجمین بگرم، نەدەبوو بەم ڕۆژە ڕووناکە بهاتیتایە. دەبوو ئەوە بزانیت کە سەربازەکان لاشعورانە هەموو شتێکیان خستۆتە ژێر چاودێرییەوە، تەنانەت حەیوانەکانیشمان.

بەقوربانت بم، گوێم لێبگرە و هەرئێستا بڕۆرەوە بۆ لای ئەوانی دیکە لەو کێوانە.

سلێمان ئەو خواردنەی کە لەگەڵ خۆی هێنابووی، بۆی دادەنێت و جلە سپییەکان لەبەر باپیرەم دادەکەنێت، بانتۆڵێکی فشی ڕەش و کراسێکی ڕەنگ تاریکی لەبەر دەکات و پشتێنێکی ڕەشیشی بۆ دەبەستێت. دەستکانی ڕادەموسێت و دیسان بەرەو شاخی سپی بەڕێدەکەوێت. هێشا نیوەی ڕێگاکەی نەبڕیبوو کە بیر لە خێزانەکەی دەکاتەوە. بیری دایک و باوک و براکانی کە ماوەیەکی زۆر بوو نەیبینیبوون، ئەمەش وای لێدەکات کە بریار بدات بچێت سەردانێکیان بکات. ڕێگایەکی باریک دەگرێتە بەر و بەرەو گوندەکەیان سی هەنگاوێک دەگەڕێتەوە، کە دەکەوێتە نزیک قەرارگای سەربازیی تورشماک.

سپێدەی بەیانیان مرۆڤ دەیتوانی گوێبیستی چریوەی سیسرکەکان بێت، دەمەو نیوەڕوانیش گەرمایەکی پرووکێنەری هەبوو. سلێمان هێندە بە خێرایی رایدەکرد کە باڵندەکان دەیاندایە فڕین کاتێک بەنێو کێڵگە بایەرەکاندا تەی دەکرد. بەسەر تەپۆلکەیەکدا سەرکەوت بوو، بەبێ ئەوەی گوێ بە هیچ بدات و بەچاکی لە دەوروبەری خۆی بڕوانێت، کاتێک ئەو بە تەپۆلکەکەدا سەردەکەوێت بیری هەر لای خۆشەویستانی دەبێت، کەمێک لە نێو دەوەنێکدا دەحەسێتەوە،

دەستی بە فیکە لێدانێکی خەفەتاوی دەکات، چارەنووسەکەی وابوو دەبێت بکەوێتە نێو کەمینێکەوە. کە هەست دەکات گوللە بەهەرچوار دەوریدا دەبارێت، ویستبووی وەکو گا کێویەک خۆی ڕزگاربکات، بەڵام لە باریکە ڕێیەکدا سەربازێکی لێ پەیدا دەبێت و هەتا دەتوانێت قۆناخە تفەنگێکی پیا دەکێشت.

هەتاوەکو نەیان گەیاندەبووە مۆڵگە سەربازییەکە بەهۆش خۆی نەهاتبووەوە، ئەفسەرە دەرەجەدارەکان و ئەوانەی لە دەوروبەری بوون، دەیانناسی. ئەوان بە "سلێمانە سەگەی تیژ ڕەو" بانگیان دەکرد و وەکو پەیامبەرێک لە نێوان خێڵەکانی دێرسیم چاویان لێدەکرد. لەوێ بە شێوەیەکی تایبەتی کە پێشتر خۆیان بۆ ئامادەکردبوو، مامەڵەیان لەگەڵ کردبوو، کە جێگای سەرسوڕمان بوو.

هەواڵی گرتنی سلێمان دەگەیەننە ئەو جەنراڵەی بەرپرسیارێتی هەموو ڕێکخستەکانی سوپای لە ئانکارا لە ئەستۆدابوو، سەرپەرشتی هێرشەکانی دێرسیمی دەکرد، لەو کاتەدا ئەو لە شاری مالازگریت بوو. فەرمانی بە پیاوەکانی دابوو، دیلەکەی بۆ بهێنن. ڕۆژی دواتر سلێمان خۆی لەبەردەمی جەنڕاڵەکەدا دەبینێتەوە، بە تیلەی چاو سەیری دەکرد:

- جەنراڵ لێی دەپرسێت، تورکی دەزانیت؟ دەزانیت بنووسیت و بخوێنیتەوە؟

کاتێک ڕووبەڕووی بێدەنگی سلێمان بووەوە، بانگی وەرگێڕێکی کرد بوو:

- لێی بپرسە بزانە دەزانێت بنووسێ و بخوێنێتەوە، بزانە حەرفەکان دەناسێت!

لە وەڵامی وەرگێڕەکەدا سلێمان بەم وشانە وەڵامی دایەوە:

- نە دەزانم بنووسم و نەدەشزانم بخوێنمەوە، ئەوە خۆ دەربارەی ئەلفبێ هەر هیچ نازانم.

جەنراڵەکە خۆشییەک بە دڵیدا دێت کە ئەو پیاوە باشەی کەوتۆتە بەر دەست، پرسیارێکی دیکە ئاراستە دەکات؟

- شارەزایت لە سەر شاخی سپی هەیە؟
- سلێمان بۆی ڕوونکردبووەوە، بەڵێ هەیەتی.

جەنراڵەکە دەست پێدەکاتەوە:

- هیچ خزم و کەسوکارت هەیە، کەسانێک کە زۆر لێتەوە نزیکبن؟

سلێمان سەرێکی بۆ لەقاند:

- ئەی چۆن نیمە، ژمارەیەکی تا ڕادەیەک زۆریشم هەیە.

دوای ئەو قسانە، جەنراڵەکە، زەرفێکی نامەی دەرهێنا کە مۆرو و نیشانەی خۆی لەسەر بوو، زەرفەکە نامەیەکی تێدابوو کە هەر خۆی نووسیبووی و بە دەستی خۆشی ئیمزای کردبوو، نامەکە لە سلێمان دەباتە پێشەوە و پێی دەڵێت:

- ئەم نامەیە بە تۆ دەسپێرم، بڕیاری نوێی تێدایە کە لە ئانکاراوە دەرکراوە. لە ئەمڕۆوە، چیتر ژیان و مردن لە دێرسیم لەدەستی سوپادا نییە. ئەفسەرەکانم، بۆیان باسکردووم کە تۆ باش ڕادەکەیت. ئەو کەسانەی کە ڕایانکردووە بۆ سەر شاخی سپی، دەبێت دەستبەجێ

بگەڕێنەوە بۆ نێو کەسوکاریان. سلێمان بەم هەواڵە زۆر دڵی خۆش دەبێت، بزە دەکەوێتە سەر دەموچاوی. بە پەلە نامەکەی لێ وەردەگرێت:

- جەنراڵی بەرێز، هەتا هێز لە قاچ و سییەکانمدا هەبێت رادەکەم.

جەنراڵەکە بە پەنجە ئیشارەتێکی بۆ کرد:

- بڕوانە، زەرفەکە بە مۆرێکی سوور نیشانە کراوە، ئەگەر نامەکە بکەیتەوە یانیش ڕێگا بدەیت کەسێکی دیکە بیبینێت، ئەوا سەرۆکی سوپا هەرگیز دیلەکان بەرنادا. ئێستاش کە من ئەم نامەیە بە تۆ دەسپێرم، چارەنووسی هەموو دیلەکانی شاخی سپی کەوتۆتە دەستی تۆوە. ئێستا دەزانیت کە تۆ چ بەرپرسیارێتیەکت کەوتۆتە سەرشان؟

- سلێمان لە وەڵامدا دەڵێت: بەڵێ گەورەم، دەزانم. ئەم نامەیە لەلای من بەقەد ژیانی ئەو سەدان کەسەی کە من دەیانناسم و خۆشم دەوێن، بە نرخە.

جەنراڵ کە دەبینێت سلێمان دەستەکانی دەلەرزن پێی دەڵێت:

- کەمێک ڕاوەستە. من بەڵگەیەکت دەدەمێ کە ئیمزا و مۆری خۆمی پێوەیە، واتە تۆ ئیتر ئازادیت لەو ناوچانەی کە مەبەستە و کەس ناتوانێت ڕێگات لێبگرێت.

سلێمان بەشێوەیەک ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو کە دەیویست وەکو باڵندەیەک بدات لە شەقەی باڵ. ویستی دەستی جەنراڵەکە ماچ بکات بەڵام ئیشارەتێکی وەرگێڕەکە پاشگەزی کردەوە. جەنراڵ، بەڵگەکەی بۆ ئامادەکرد و لەگەڵ نامەکەدا تەسلیمی سلێمانی کرد و پێی گوت:

- هەتا زووتر نامەکە بگەیەنیتە جێگای مەبەست، زووتر دیلەکان ئازاد دەبن.

سلێمان، نامە و بەڵگەکەی خستە نێو گیرفانییەوە، وەکو تیرێک، مەکتەبی جەنراڵی بەجێهێشت. هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو، دەیویست کام ڕێگا نزیکە ئەو ڕێگایە بگرێت. یەکەم مەنزڵ کە بیری لێکردبووەوە گالبووسان بوو. سلێمان بیری لەو کەسانە دەکردەوە کە ڕزگاریان دەکات، مامە حوسێن کوڕی ماما ئاغا، باوکم و هاوڕێکانی منداڵیم، ئەمەش وایلێکرد کە خێراتر بڕوات. بەڵام تا دەهات قاچەکانی قورستر دەبوون و سەری دەئێشا. ئەو دەیزانی بە هۆی برسێتیەوەیە وا حاڵی خراپ بووە. خانوویەکی بینی و بەرەو خانووەکە ڕۆیشت. گەماڵێک پاسی دەرگای باخچەکەی دەکرد بۆیە هەتا پیرەژنێک نەهات بەهانایەوە نەیتوانی بچێتە ژوورەوە. لە ژوورەوە ژنێکی گەنجی بینی کە بە دڵنیاییەوە بوکی پیرێژنەکە بوو، دوو منداڵشی لەگەڵدا بوو. هەر کە دانیشت بێ دوودڵی پێی گوتن، خەریکە لە برساندا دەمرێت. پیرێژن هەستی بە پەلە پەل و پەشۆکاوی سلێمان کرد، هەر بۆیە بوو بە مەراق لای:

- ئەوە بۆ کوێ وا بە خێرایی ڕادەکەیت؟ هیوادرام خێری پێوە بێت!

بەڵام سلێمان بەبێ دەنگی دانیشتبوو، لەوە دەترسا کە سیحری نامەکە بەتاڵ ببێتەوە. شلکێنەو پەنیرەکەی هەڵلووشی و دۆکەی نا بەسەریەوە و بەیەکجار هەڵی قوڕاند و سوپاسی کردن:

- یاخوا ماڵتان ئاوا بێت و دوزگوون بابا دەست بە باڵتانەوە بگرێت.

دەستی بەڕۆیشتن کردەوە، ئێستا هیچ شتێک نەیدەتوانی بیوەستێنێ. قاچەکانی وەکو خۆیان لێهاتبووەوە، وەکو با بە نێو دۆڵ و تەپۆلکە و ڕووبارەکاندا، دەڕۆیشت. هەمانکات، خەیاڵ بردییەوە. ئەو دەیزانی ڕاکردنی ئەمجارەی دەبێتە خێراترین ڕاکردن لە ژیانیدا. هێندە ماندوو ببوو ئارەق هەموو گیانی تەڕ کردبوو، ماسوولکەکانی ڕەق ببوون، بۆیە هەناسەی قوڵی هەڵدەمژی. کاتێک بەسەر لووتکەکەدا ڕایدەکرد، وای دەزانی قاچەکانی بەسەر زەوییەوە نین، وەکو ئەوە وابوو کە دەفڕێت. جارجارێک باڵەکانی وەکو باڵندەیەک دەکردەوە و هەوا دەچووە ژێر کراسە نیوە کراوەکەیەوە و پڕ دەبوو لە هەوا. هەندێک جاریش وەکو ئەسپێک وابوو کە لە چوارناڵەدا بێت.

سلێمان دەیتوانی وەکو هەموو ئەو گیاندارانەی دەیناسین، وەکو گورگ، بارگیر، ئاسک، سمۆرە، بەراز و تەنانەت وەکو پشیلەیەک کە ئاگریان لە کلکی بەردابێت، رابکات. لە هەر ناوچەیەک، لاسایی یەکێک لەو گیاندارانەی دەکردەوە. ئەو وایدەزانی کە خەبەرێکی خۆشی پێیە و ئەو ڕۆژەش خۆشترین ڕۆژی ژیانی بوو، بۆ یەک چرکەساتیش هەستی بە ماندوویەتی نەدەکرد.

شەو داهات، بەڵام نەبووە بەربەستێک لەبەردەم رۆیشتنی سلێماندا، چونکە هەنگاو بە هەنگاو شارەزای ڕێگاکان بوو. کاتێک تیشکی مانگ چواردەوری سلێمانی رووناک کردەوە، دەستی بە گوتنی گۆرانییەکی خەفەت ئامێزی کوردی کرد و هەنگاوەکانی لەگەڵ ڕیتمی گۆرانییەکەدا هەڵدەهێنایەوە. نیوەشەو بوو کە گەیشتە گالبووسان، دوای ئەوەی دەشتی

پیرگرد و جەنگەڵەکانی شاخی سپیی بڕی. کاتێک سلێمان لەدەرگای دا، ئێمە لە شیرین خەودا بووین. هەر ئەو شەوە سەگەکەمان سیتچۆ، دوای مووسای برام کەوتبوو بۆ نێو دارستانەکەی شاخی سپی. دەنگی دەرگاکە دایکمی خەبەرکردەوە و چراکەی هەڵکرد و دەرگاکەی کردەوە. سلێمان لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەکو شێتێک دەستی بە هەڵپەرکێ کرد، بە خۆی زەرفەکەی دەستییەوە، پڕ بە گەروی پێدەکەنی و دەخولایەوە و فیکەی خۆشیی لێ دەدا. زەرفە زەردە بە نرخەکەی وەکو دەستەسڕێک ڕادەوەشاند. من هێشتا نیوە خەوالّو بووم، وامدەزانی خەو دەبینم. بەلاّم کە گوێم لە هاواری دایکم بوو تێگەیشتم کە ئەوە خەو نییە و ڕاستییە:

- قەزات لەمن کەوێت سلێمان، خەبەری خۆشت پێیە یان بەتەواوەتی شێت بوویت؟

سلێمان هەر دەخولایەوە و نامەکەی ڕادەوەشاند. دایکم دوو جار بە قایمی شانی ڕاتەکاند!

- سلێمان، سلێمان! دەبڵی، شتێک ڕوویداوە؟ لەگەڵ تۆمە کابرا!

بەلاّم لەوە زیاتری ویست تا هاتەوە سەرخۆی. سلێمان، زەرفەکەی راوەشاند:

- شتە نهێنییەکە وا لەم زەرفەدا! ئەمە هەموو شتێکی تێدایە!

دایکم نەیدەزانی چی بکات، داوای لە سلێمان کرد:

- بەقوربانت بم! ئەگەر شتێک دەزانیت پێمان بڵێ و چیتر گاڵتەم پێ مەکە.

- سلێمان دایکمی ماچ کردو باوەشی پێداکردو دەستی گرت تا هەڵپەڕی.
- ئەوان ڕزگاریان بوو! بەمزووانە هەمویان ئازاد دەکرێن.

دایکم دەستی بە هاوار کردو، خۆی لە دەستی سلێمان راپسکان. بەلاّم براژنەکانم سەبریان نەمابوو، سلێمان ئارام بووەوە و ویستی دڵنەواییان بکات:

- براژنە خۆشەویستەکانم چیتر نیگەران مەبن! لێم گەڕێن با خۆشحاڵ بم، ئێوەش دڵتان خۆش بکەن.

ئێمەیەک کە ئاگامان لە هیچ شتێک نییە بۆ دەبێت لەو خۆشییەی تۆدا بەشداربین؟ براژنەکانم ئەوەیان گوت. سلێمان درێژەی بە قسەکانی دا:

- وەکو پێم گوتن، ئەوانەی لە شاخی سپی گیراون، ئازاد دەکرێن، نهێنی ئەوەش وا لەم زەرفە دایە،دیسان نامەکەی راوەشاندەوە، بەلاّم ئێمە هیچمان لێ حاڵی نەبوو.

دایکم دەستی گرت و دەستی بە پاڕانەوە کرد لێی:

- دانیشە! لە نوکەوە هەموویمان بۆ بگێڕەوە. لەسەر قەراخی تەختی نووستنەکە دانیشت و دەستی بە گێڕانەوە کرد کە چۆن سەرەتا چووە بۆ لای ماما ئاغا و داوای لێکردبوو کە خۆی بشارێتەوە، بەلاّم ئەم گوێی لێنەگرتبوو. پاشان باسی ئەوەی کرد کە چۆن گرتویانە و چۆن لەلایەن جەنراڵەکەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کراوە. دیسان نامەکەی راوەشاندەوە.
- هەر کە ئەم نامەیەم گەیاندە دەستی فەرماندارى شاخی سپیی، هەمویان ئازاد دەکات.

دایکـم بـە بیسـتنی ئـەو هەواڵـە، لـە خۆشـیاندا شاگەشـکە بـوو، ڕای کـردە دەرەوە و هەتـا توانـی بەنـاو ئـەو تاریکییـەدا هـاواری کـرد:

- گوێـم لـی بگـرن! دەوڵەتـی ئەنکارا، نامەیەکیـان نـاردووە کـە جەنراڵـی مازگیـرت داویەتـی بـە سـلێمان، بەیانـی پیاوەکانمـان ئـازاد دەکرێن.

ئـەو هـاوارەی دایکـم هەمـوو ژنەکانـی ئاوایـی بەخەبـەر هێنایـەوە، هەمـوو بـە پەلـە پـروزێ بـە خۆیـان و فانۆسـەکانی دەسـتیانەوە ڕوویـان لـە ماڵـی ئێمـە کـرد. ئـەوە لـە حاڵێکدا بـوو کـە دایکـم هێشـا خوتبـەی خـۆی دەدا؛ دەوڵەتـی ئانکارا، فەرمانـی دەرکـردووە و لەلایـەن جەنراڵـەوە دراوە بـە سـلێمان، ژنـەکان وایـان دەزانـی کـە دایکـم ئەقڵـی لەدەسـت داوە، بۆیـە لەگـەڵ خۆیـان هێنایانـەوە ژوورەوە، بـەڵام کاتێـک چاویـان بـە سـلێمان کـەوت، لـە خۆشـیاندا دەسـتیان بـە هەلهەلـە لێدان و سـەماکردن کـرد. هەندێکیـان کەمێـک بـە گومـان بـوون، بۆیـە داوایـان لـە سـلیمان کـرد کـە نامەکەیـان پیشـان بـدات. ئـەو داوایـە کەمێـک کەلـەی سـلێمانی هێنایـە جـۆش:

- تکاتـان لـێ دەکـەم، لـە مـن زیاتـر کەسـی تـر بـۆی نییـە دەسـتی بـەر ئـەو نامەیـە کەوێـت، دەنـا سـیحری نامەکـە بەتـاڵ دەبێتـەوە و دیلەکانیشـمان ئـازاد ناکـەن، ئاخـر ئـەوە قسـەی جەنـراڵ خۆیەتـی.

لـە کاتێکدا سـلێمان خەریکی خواردنـی ئـەو خواردنـە بـوو کـە بۆیـان دانابـوو، ژنـەکان بـە بەردەوامـی بـە دەوریدا هەڵدەپەڕین. دەکـرا ئـەو هیوایـە خواسـتێکی شـێتانەی خـۆی نیشـان بدایـە.

پاشـان سلێمان داوای لـه ژن و منداڵـەکان کرد کـه ئارام بنـەوە و هـەر یەکـه بڕواتـەوە بـۆ ماڵـی خۆی:

- خۆتـان دەزانـن مـن هیلاکـم و پێویسـتـه پێش خـۆر هەڵهاتـن بکەومـه ڕێ، ئەگـەر خـوا ڕازیـی لەسـەر بێت ئـەوا بەیانـی نیوەڕۆکـەی لێـره یەکتـر دەبینینـەوە.

جێگایـان بـۆ سلێمان ڕاخسـت و هەریەکـه بـۆ ماڵـی خـۆی گەڕایـەوە. نامەکـەی بـاش قایمکـرد و بـەدرۆ خـۆی کـرد بـه نووسـتوو، بەڵام هیـچ کام لـه ئێمـه نەمانتوانـی یەکسـەر خەومان لـێ بکەوێـت. لـه نیـوە شـەودا، دەرگای ژوورەکـەی کـردەوە و بەبـێ ئەوەیـه یـەک وشـه بڵێـت لـه تاریکیـدا ونبـوو. دەمـەو نیوەڕۆ بـوو کـه گەیشـتـه گوندی گەچـه و نامەکـەی ڕاوەشـاندو وەکو پەیامبەرێـک کـه خەبـەری خۆشـی لـه هەگبـەدا بێت گوتـی:

- ئاگادارایيەکـم هێنـاوە لـه ئانـکاراوە دەرکـراوە، لـه ئێسـتاوە سـوپا مافـی ئـەوەی نییـه لەسـەر چارەنووسـی ژیـان و مـردن لـه دێرسـیم بڕیـار بـدات. گوندنشـینەکان لـه بەرزایەکانـی سـەروی گوندەکـەوە گوێیـان لـه بانگەکـەی سـلێمان بـوو.

کاتێـک گەیشـتـه لای ئـەو خێمەیـەی کـه بەکـۆ پاسـەوانی دەکرد، بەکۆ سـلێمانی ناسـییەوە و بـه پەلـه بـەرەو ڕووی چـوو:

- ئەوە چییه دەڵـی بـه تەواوەتـی تێکچوویت، لێره چیدەکەیت؟

سلێمان وەک ئـەوەی هـەر لەگـەڵ ئەویشـی نەبێت، ڕێگایەکـی نزیکـی گرتەبـەر تـا خـۆی بگەیەنێتـه سـەر بەرزایەکـەی شـاخـی سـپی. چـاوی بـه سـەربازەکان کـەوت و دەسـتی بـه دەسـت ڕاوەشـاندن کـرد، بـه خـۆی و نامەکـەی دەسـتییەوە لێیـان چـووە پێشـەوە:

- من ئاگادارییەکی گرنگی ئانکارام هێناوە! نامەکەی دایە دەست سەربازەکان و بۆ خۆشی بەرەو لای دیلەکان چوو.

سەرەتا سەربازەکان بەو هاتنە لە پڕەی سلێمان واقیان ورما، بەڵام پاش کەمێک زۆر گوێیان پێ نەداو کشانەوە. ئەو خۆی لە خێسەی سەربازەکان دزییەوە و چوو بۆ لای دیلەکان:

- نامەیەکی جەنەراڵم لەگەڵ خۆم هێناوە. سوپا چیتر فەرمانی کوشتن و ژیانی ئێمەی لەدەستدا نەماوە، بەزووی هەموتان ئازاد دەکرێن.

لە پڕ نیگاکانی لەگەڵ نیگای مامەم حوسێن یەکانگیر دەبێت، تێبینی ئەوەی کرد کە ڕەنگ و ڕوویی چەند خەفەتبار و چەندێکیش ماندوو دیارە، لێی چووە پێشەوە:

- بەقوربانت بم حوسێن! کەمێکی تریش دان بەخۆتا بگرە، تۆ نەجاتت دەبێت، بۆ ئەوەی دڵنەوایی بداتەوە، ئەوەی پێگوت!

لە هەمان کاتدا سەربازەکان لە خێمەی سەرلەشکرەوە وەکو پورە هەنگ هاتنە دەرەوە، چواردەوری دیلەکانیان گرت، فەرمانیان پێدرابوو کە رووی لوولەی چەکەکانیان بکەنە دیلەکان.

مامەم حوسێن کە کوڕی ماما ئاغا بوو، سەیرێکی دەموچاوی بێگەرد و بێ ئاگای سلێمانی کرد و پێی گوت:

- بەدبەختی چارە ڕەش، چ پێویست بوو خۆت بخەیتە نێو ئەم دۆزەخەوە؟ ئەوەی کە تۆ هێناوتە لەگەڵ خۆت پەیامی مەرگی ئێمەیە!

سلێمان زارەترەک ببوو، وەکو چەقۆیەکیان لێدا بێت لە نێو دیلەکاندا کەوتە سەر زەوی، فریای ئەوە کەوت بڵێ:

- ئاخ، ئەوە من چیم کردووە؟

مامەم حوسێن بەوپەڕی میهرەبانییەوە دەستی بەسەریدا دەهێنێت و بە پرتە پرتێک پێی دەڵێت: ئەوە چارەنووسە.

سلێمان ڕووی خۆی بەلای دیلەکاندا وەردەچەرخێنێت. هەندێکیان دەست، هەندێک قاچ شکاو، ئەوانی دیکەیش ڕەنگی مردوویان لێنیشتووە، کەمێک بیر لە چارەنووسی خۆی کردەوەو گوتی:

- کەواتە من پەیامی مەرگی ئێوەم لەگەڵ خۆم هێناوە، کەواتە دەبێت لە پێش ئێوەشدا بمرم.

تاوی دایە خۆی بەرەو لای دەشتاییەکە، بەنێو ئەو هەموو چەک بەدەستەدا، زیاتر لەوە دەچوو کە بفرێت تا ڕابکات، کەس نەیدەزانی کە ئاخۆ ئەو بەرەو مردن یان بەرەو ئازادی ڕادەکات. سەربازەکان کەوتنە تەقە لێ کردنی. سلێمان وەکو باڵندەیەک بەرزبووە و دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە، کەمێک خۆی گورج کردەوە و تەقلەیەکی لێدا، لەسەر پێیەکانی خۆی گیرساندەوە، پاشان بەهەر چوار لادا ڕایدەکرد، گولەش بە هەرچوار لایدا، گیز و هوڕیان بوو. بۆ دواجار کەوتەوە ڕاکردن، بەلام بەبێ ئەوەی جوڵەیەکی لێوەبێت بەدەمدا کەوتە سەر زەوی. سەربازەکان شڵەژابوون، بە هەر چواردەوریاندا دەخولانەوە. هەندێک لە دیلەکان خۆیان گەیاندە لای سلێمان. مامە حوسێن، سلێمانی خستە سەر پشت و ناوچاوانی ماچ کرد، پاشان بە پشتێنەکەی دایپۆشی. گەڕایەوە بۆلای ئەوانی دیکە.

سەرلەشکرەکە بەهەرچوار دەوری خۆیدا، فەرمانی دەردەکرد. دوو ڕەشاشیان هێنا و لە بەرزاییەکەدا دایان بەستن. سەربازەکان هەتا توانیان بە قۆناخە تفەنگ کەوتنە لێدانی دیلەکان، پاشان لە ریزێکی درێژدا هەموویانیان ڕیز کردن، هەر لە قەراخی تاشە بەردەکانی (زمیکەوە) هەتا دەگەیشتە پێدەشتەکە. ئەوانەشی نەیاندەتوانی بە پێوە بووەستن، لەسەر زەویەکە لەبەردەمی ئەوانەی دیکەدا کە بە پێوە وەستابوون دایان دەنیشاندن. کالۆ، پیاوێک بوو ڕۆژانی سەختی زۆر دیبوو، بەشێوەیەکی وا دەستی بە قسەکردن کرد کە هەموویان گوێیان لێ بوو:

- ئێمە موسڵمانین، ڕێگامان بدەن تا ڕوومان بکەینە مەککە!

لەو گێژاوەی تێی کەوتبوون، دوای قسە چاوەڕواننەکراوەکانی، کالۆ، سێ گەنج کە پێکهاتبوون لە عەلی باڤایی دیلی، حوسێن عەلی خەلفی و ویلە عەلی خدر، کە لە ریزی پێشەوەی ڕیزەکەدا وەستابوون، فرسەتیان هێنا و بە هیوایەکی بەتاڵەوە دەستیان بە ڕاکردن کردو لەبەرچاو ونبوون. گوولە وەکو باران بەسەریاندا دەباری، بەڵام بەبێ ئەوەی نیشانەکانیان بپێکن. بەبێ ئەوەی کەسیان بەربکەوێت، لە دەست سەربازەکان ڕزگاریان بوو. ویلە، کاتێک کەوت بەسەر زەویەکەدا قاچێکی شکا، بەڵام هاوڕێکانی کۆڵیان کرد و هەرسێکیان بە دۆڵەکەدا چوونە خوارەوە.

ڕاکردنی ئەو سێ گەنجە، سەربازەکانی شێت و هارکرد، هەر بۆیە جارێکی تر بە قۆناخە تفەنگ بەربوونەوە وێزەی دیلەکان. هەر دوای ئەوەش هەردوو ڕەشاشەکە کەوتنە تەقەکردن و یەک لە دوای یەک دیلەکان بوونە قوربانی.

هاوار و پاڕانەوە تێکەڵ بە دەنگی تەقەکان دەبوو:

- ئەی خوایە! ئەی موحەممەد! هۆ دۆزگون بابا!

کاتێک تفەنگەکان بێدەنگ بوون، بەرزاییەکانی شاخی سپی لە دەشتی کەربەلا دەچوون.

سەربازەکان، تەرمەکانیان لەبەر ئەو هەتاوە گەرمە بەجێهێشت و گەڕانەوە بۆ گوندەکان بەو ئامانجەی، کۆتایی بە ژن و منداڵەکانیش بهێنن.

## ٥

هەمان ڕۆژ، هەواڵی کۆمەڵکوژییەکەی شاخی سپی کە باوکم و مامەکەشمی تێدابوو، گەیشتە گوندەکەمان. کاتێک سەربازەکان لە سەر شاخەکەوە دێنە خوارەوە، دەبن بە دوو بەشەوە. بەشێکیان دەچن بۆ زمێک و ئەوی تریشینان بەرەوە گوندی کەچ دەچن، ژن و منداڵەکان کۆدەکەنەوە و ئاگر لە ماڵەکان بەردەدەن. تەنها کەسێک کە ڕزگاری بوو، منداڵێک بوو ئەویش زووتر لە کاتی خۆی لە دایک ببوو. ئەو منداڵەیان بە سەرە نێزە لە سکی دایکی دەرهێنابوو.

کە ژنەکانی گوندەکەمان گالبووسان ئەو هەواڵەیان بیست، بەجارێک زەندەقیان چوو، هەریەکەو منداڵی خۆی کردە قەڵادۆشکانی و بەرەو لووتکەی زارگۆڤیت هەڵکشان. من و دایکم و دوو براژنەکەم و منداڵەکانیان، ماڵەکەمان بەجێهێشت و ڕوومانکردە دارستانەکان، هەروەها سەگەکەشمان بەدوامانەوە بوو، بە دەقە لێمان جیا نەدەبووەوە. بەڵام دایکم نەیدەوست گالبووسان بەجێبهێڵین، بۆیە لە نزیک گوندەکەوە لە بن چەند دارێکی گەوەرە کە دەکەوتنە لای سەرووی ئاواییەوە، ماینەوە. براژنەکانم قاڵیچەیەکیان بە بەینی دوو

دارەوە هەڵواسی بۆ منداڵەکان. ئەو شەوەمان لە نێو ئەو دارستانەدا بەسەر برد. برا گەورەکەم، سلێمان، لە پڕ لە نیوە شەودا پەیدابوو، تا لە هاتنی سەربازەکان بەرەو دێکەمان ئاگادارمان بکاتەوە. ویستی لەگەڵ خۆی بمانبات بۆ نێو قوڵایی دارستانەکە، بەڵام دایکم ملی نەدا و ڕازیی نەبوو. بۆیە ئەویش کۆڵی داو بەجێی هێشتین، بەڵام پێی گوتین دەبێت بێدەنگ بین. هەروەها گوتی پێم وانییە سەربازەکان بوێرن هەموو شوێنێکمان بەدوادا بگەڕێن.

هێشتا دنیا بەتەواوەتی ڕووناک نەبووبووە کە سەربازەکان چواردەوری ماڵی سەید باکلیسیان گرت. ژنەکەی سەید، بەسێر خانم، لەگەڵ دوو لە کارەکەر و کچە بچکۆلانەکەی دلیف و هاسل بابا، کوڕە شەلەکەی مێردەکەی (لە ژنێکی دیکەی سەید بووە. وەرگێڕ) هاتنە دەرەوە. بەسێر خانم سەرەڕای ئەو هەموو تکاو ڕجایەی دایکم لێی کرد، بڕیاریان دابوو دێکە چۆڵ نەکەن.

با جارێ ئەوەی لەسەر بەسێر خانم دەیزانم بۆت باس بکەم. بەسێر کچی عەلی خدر، سەرۆک عەشیرەتی ئەوەی پێیان دەگوت بنعەشیرەی بودان سەر بە خێڵی کورشیخان. هیچ ژنێک هێندەی ئەو شۆخ و شەنگ نەبوو، قژە ڕەشە لوولەکەی دەگیشتە سەر کەمەری، باریک و تا بڵێی ڕێکوپێک بوو. گەردنی سپیی وەکو هی قاز وابوو، جووتێک چاوی ڕەش و گەورەی پێوەبوو. باوک و براکەی حەسەن ئەفەندی زوو زوو سەردانی ئیستەنبوڵیان دەکرد و پەیوەندییەکی بەربڵاویان هەبوو. هەموو جارێک کە لە سەفەر دەگەڕانەوە، جلی جوانیان لەگەڵ خۆیان بۆ دەهێنا.

کاتێک تەمەنی بوو بە هەژدە ساڵان، پیاوانی بەناوبانگی دێرسیم کەوتنە چاودێری کردنی، خەڵکیان دەناردە خوازبێنی، بەڵام بەسێر هەموو جارێک خوازبێنیکەرانی ڕەتدەکردەوە.

سەید باکلی لە گالبووسان دەژیا، واتە دێکەی ئێمە. ئەو خزمایەتی لەگەڵ سەرۆکی بنەعەشیرەی شێخانی سەر بە خێڵی کوریشاخاندا هەبوو، پیاوێکی شان و مل پان و چوتێک سمێڵی درێژی پێوە بوو، دەوڵەمەند بوو، پێویستی بە خۆماندوکردن نەدەکرد، هەربۆیە بە سواری ئەسپە سپییەکەوە لەم گوند بۆ ئەو گوند دەگەڕا.

وەک دەڵێن، ڕۆژێکیان میوانی حەسەن ئەفەندی دەبێت، چاوی بە بەسێر خاتوون دەکەوێت. دەستبەجێ ئاشقی دەبێت، بەڵام ئەو ژنی هەبوو، ژنەکەشی کچی حوسێن تووسکی بوو، دوو منداڵیشی لێی هەبوو. بۆ ئەوەی باسی ئاگری خۆشەویستی خۆی بۆ بەسێر خاتوون بکات، ژنێک دەنێرێت بۆ لای. بەڵام بەسێر لە وەڵامدا دەڵێت: مادام ئەو ژنی دیکە هەیە، نابێت باسی شتی وا بکات!

هەمان ڕۆژ بڕیاری خۆی دەدات و ژنەکەی تەڵاق دەدات. بەو شێوەیە بەسێر خاتوون ڕازی دەبێت. بەڵام باوک و براکەی بەو خزمایەتییە ڕازیی نابن. سەید باکیل بۆ ڕازیکردنیان ئەوەی لەدەستی هات کردی، بەڵام بێ سوود بوو. وەکو دەڵێن ئێوارەیەکیان سەید لە نزیک ماڵی باوکی کچە خۆی دەشارێتەوە، هەتا نیوەشەو چاوەڕێی بەسێر دەکات. هێشتا بەسێر نەهاتبوو، لەگەڵ پیاوەکانی لەپشتەوە کونێک لە خانووەکەیان دەکەن. بەسێر لە ژوورەکەی خۆی خەریکی خۆ ئامادەکردن دەبێت، سەید باکلی لەپشت خۆیەوە

سـواری ئەسـپەکەی دەکات و بەهەمـان ڕێـگای کـە لێـوەی هاتبـوون دەگەڕێتـەوە. بەدەسـتێکی ئاوزەنگـی ئەسـپەکەی و بـە دەسـتێکی دیکـە ناوقـەدی بەسـێر دەگرێـت، پێکـەوە وەکـو بروسکەیەک لـە نێـو تاریکیـدا بـە چوارناڵـە ون دەبـن.

بـە گەیشـتنیان بـۆ ماڵـەوە هـەر ئـەو شـەوە لـە خـۆی مـارە دەکات. ئـەم هەڵگرتنـە دەبێتـە هـۆی بەرپابوونـی شـەڕ لـە نێوان عەشـیرەتی شـێخانی و بودانییەکانـدا و چەکـی تێـدا بـەکار دەهێنرێـت. بـەڵام پیاوانـی بەدەسـتەڵات، پیـر و سـەیدەکانی دێرسـیم دەکەونـە بەینیانـەوە، بۆئـەوەی پێکیـان بهێنـن.

چەنـد سـاڵێک دوای ئـەوە، لەگـەڵ ئـەوەی بەسـێر خاتـوون چـوار کـوڕ و کچێکـی بەدنیـادا هێنابـوو، یـەک زەڕە لـە جوانییەکـی خـۆی لەدەسـت نەدابـوو. هـەر وەکـو جـاران قـەد بڵنـد و ڕووخسـارێکی پـان و درەوشـاوەی وەکـو ئەسـتێرەی هەبـوو. بـەڵام خـەم و خەفـەت بووبونـە بـار لەسـەر دڵـی و پوکانبویانـەوە، ئـەوەش دوای بیسـتینی هەواڵێـک کـە وایلێکـرد نەتوانێـت لـە سـەید باکیـل خـۆش ببێـت. ئاخـر سـەید باکیـل گیـرۆدەی دەسـتی گوڵسـا خاتـوون ببـوو کـە یەکێـک بـوو لـە ژنەکانـی سـەید حوسـێن سـەرۆکی عەشـیرەتی کوریشـخان کـە سـاڵێک پێشـتر لـە شـاری ئەلعەزیـز لـە سـێدارە درابـوو. کاتێک بـەو پەیوەندییـە دەزانێـت بڕیـاری جیاکردنـەوەی ژووری نووسـتنی خـۆی لەگـەڵ مێردەکـەی دەدات. بەسـێر خاتـوون تەسلیمی ئـەو چارەنووسـە دەبێـت، بەبـێ ئـەوەی لـە لای کـەس بیدرکێنێت. دایکم بۆ خـۆی ئـەوەی دیتبـوو، هـەر ئـەوەش وایلـە بەسـێر خاتـوون کردبـوو، سـەرەڕای ئـەو مەترسـیە گەورەیـەش کـە ڕووبەڕوویـان ببـووەوە لـە ئاواییـدا بمێنێتـەوە.

- دایکم دەیگێڕایەوە، بەسێر خاتوون نەیدەویست چیدیکە بژی، بەڵکو دەیویست بمرێ.

قسەو باسی دیکەیش بڵاوبووبوونەوە، گوایە سەید باکیل بە مەبەست بەسێر خاتوونی لەو خانوەدا بەجیهێشتبوو. چونکە هەمان ڕۆژ کە ئێمە گوندەکەمان بەجێهێشت، ئێوارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناو ئاوایی بۆ ئەوەی هەر چوار کوڕەکەی لەگەڵ خۆی بەرێت، گوایە بە بەسێر خاتوونی گوتووە:

- تۆ دەتوانیت لێرە بمێنیتەوە، هیچ مەترسییەک نییە. سەربازەکان چەند پرسیارێکتان لێ دەکەن و تۆش پێیان بڵێ کە خوشکی حەسەنە فەندی، ئیتر وازت لێدەهێنن.

حەسەنە فەندی، پیاوێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بوو، دەوڵەت هەموو دێرسیمی بەدوادا دەگەڕا. بەو شێوەیە سەید باکیل ویستبووی بەسێر خاتوون لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، چونکە هەر کە سەربازەکان بیانزانیایە خزمی حەسەنە فەندییە، دەیانکوشت. دەنگۆیەکی تریش هەبوو، گوایە سەید باکیل لەدوورەوە چاودێری خانووەکەی کردووە کە چۆن سەربازەکان چواردەوری دەگرن. کاتێکیش ژن و منداڵەکانی دەگرن، چوار لەو چەکدرانەی کە لەگەڵی دەبن، خەڵکی دێمانان دەبن، دەیانەوێت دەستیان لێ بکەنەوە، بەڵام سەید پێیان دەڵێت هەر بجوڵێنەوە هەر چوارتان دەکوژرێن.

من نازانم کام لەم قسەو باسانە ڕاستن یانیش درۆن.

لە دوورەوە لە نێو گەڵای دارەکانەوە چاومان لێبوو چی ڕوویدەدا. بەسێر خاتوون کچە بچکۆلەکەی دلیفی بە سنگییەوە نووساندبوو، هەردوو کارەکەرەکەی و هاسیل بابایان لە

خانووەکـە هێنایـە دەرەوە. هاسـیل ئیفلیـج بـوو، نەیدەتوانـی بـە ئاسـانی بڕوات، بەڵام سـەربازەکان بـە بەردەوامـی بـە قۆناخـە تفەنـگ تێیـان دەسرەواند. لـەو شـوێنەی ئێمـەی لێبووین گوێمان لـە پاڕانـەوەی کارەکـەرەکان بـوو کـە عەفویـان بکـەن. بەسـێر خاتوون، منداڵەکەی لـە باوەش گرتبـوو، ڕێـک و ڕاسـت بـەرەو ڕووبـاری گالبووسـان دەڕۆیشـت.

بەشـێک لە سـەربازەکان زۆریان لێدەکردن بپەڕنەوە، ئەوانی دیکەیـش دابـەش ببـوون تـا یـەک لـە دوای یـەک چـواردەوری خانـووەکان بگـرن. کاتێـک بینیـان کـەس لـە نێـو خانووەکانـدا نەمـاوە، دەسـتیان بـە ئاگـر تێبەردانـی خانـووەکان کـرد. گڕ لـە پەنجەرەکانـەوە دەهاتـە دەرەوە، دەیتەنییـەوە بـۆ گوێسـوانەکان کـە بـە قامیـش و قـوڕ دروسـت کرابـوون. خەمێکـی قـورس دایکمـی داگـرت و دەسـتی بـە هەڵڕشـتنی فرمێسـکەکانی کـرد.

دوکەڵێکـی ڕەش ئاسـمانی گالبووسـانی داپۆشـی. هـەردوو ئاشـی ئاواییەکـە بوونـە قەرەبرووت وەکـو ئـەوە وابـوو کـە بـەر تـۆپ کەوتبێتـن هـەروەک خانووەکانـی دۆیـی گێـڕ، کاک عەلـی بەرتـی و سـەید باکیـل. کاتێـک گەرمـی ئاگرەکـە گەیشـتە لای ئێمـە، لـە نێـو دڵمانـەوە هەسـتمان بـە گەرمییەکـەی دەکـرد.

بە هـەزار حـاڵ لـە نێـو ئـەو چـڕە دووکەڵـەدا خانووەکانمـان دەبینـی. بـە هـاوار و قیـژە قیـژی سـەربازەکاندا دەمانزانـی کـە بەهـەر چـوار لادا ڕادەکـەن. لـە حەیوانـە پەرتەوازەکانـی ئێمـە دەچـوون.

لـەو تەپۆڵکەیـەوەی کـە خۆمانمـان لـێ شـاردبووەوە، چاومان لێبوو کە بەسـێر خاتوون و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون، گرووپێک چواردەوریـان گرتبـوون و بـەرەو دەشـتی پیرگردیان دەبردن.

ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە لە عەلی "بچکۆل"م بیست کە چیان بەسەر هێنابوون. ئەو کاتە عەلی پیاوێکی لاوازی تەمەن دەوروبەری سی ساڵ دەبوو. عەلی، کەسێکی چاوشین، کاڵ و دەمووچاوێکی درێژکۆلەی هەبوو. ئەو ئەرمەنییانەی کە لەدەست کۆمەڵکوژیی عوسمانییەکان هەڵاتبوون و هاتبوون بۆ دێرسیم، پێیان وابوو کە عەلی تورکە. عەلی قاچێکی کورت بوو، چونکە جارێک ئاوی کوڵاو بەسەر ئەژنۆیدا ڕژابوو، بەڵام کاتێک لەسەر قاچەکەی دیکەی دەوەستا، وەکو کەسێکی ئاسایی درێژ بوو، بەڵام هەر کە قاچەکەی دیکەی دادەنایەوە، یەکسەر پێوەی دیاربوو. هەروەها کاتێک بە گۆچان دەڕۆیشت بالای بەرزتر دیاربوو. عادەتێکی هەبوو، بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد.

ئەوەی کە بۆت دەگێڕمەوە، وشە بە وشەی ئەو قسانەیە کە لە عەلیم بیستووە:

سەربازەکان، بەسێر خاتوون و ئەوانی دیکەیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ پیرگیدج لە گوندی چاڵکران. من لە سەر ئەو ڕێگایە وەستابووم کە ئەوان پێیدا دەڕۆیشتن. بەسێر خاتوون، ژنی خزمێکی نزیکی من بوو، سەید باکیل، کاتێک کە بینیم ئەو لەگەڵ منداڵەکانیدا، گیراون، نەمتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانم بگرم. سەرلەشکرەکە گوێی لێم بوو، بە سەربازەکانی گوت بیگرن، بە شەق و زلە بەربوونە گیانم، گۆچانەکەیان لێ سەندم. خۆم گەیاندە نێو ریزەکە، لەو کاتەدا بە منەوە لە دوو کەسی شەل، بەسێر خاتوون و کچێکی بچکۆلە و دوو کارەکەری لەگەڵیدابوون.

دوای ئەوەی پیرگدیمان بەجێهێشت، بەرەو تەپۆڵکەی واریێ سەفتین هەڵگەڕاین کە دەکەوتە نێوان گوندی دێریک و تەپەی پولۆ سوورەوە، لەوێ لە بن دارێکی گەورە دایانیشاندین. ئەفسەرێک کە لە نزیکمانەوە وەستابوو، فەرمانی بە سەربازەکاندا: "جیایان بکەنەوە!".

ئەوان منیان ڕاکێشا، بردمیانە لایەکەوە و بە چاو بەستراوی لە نێو دەوەنە چڕەکاندا ڕایانکێشام. بە دەنگی شەق تێهەڵدان و هاوارکردن، تێگەیشتم کە حاسال بابایان لەو شوێنەی خۆی لێشاردبووەوە، دۆزیوەتەوە. گوێم لە گریانی کارەکەرەکان بوو، ئەو پەڕۆیەم لەسەر چاوم لابرد، کە چاومیان پێ بەستبووەوە، بۆ ئەوەی بزانم لە کوێم. سەربازەکان پەلاماری کارەکەرەکانیان دا، ئەوە لە کاتێکدا بوو ئەفسەرەکە بە چاوێکی دوژمنانە لە بەسێر خاتوونی دەڕوانی کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو. نەختێک لەو لای ئەو شوێنەی کە منیان لێ فڕێدابوو، دەوەنێکی تا ڕادەیەک چڕ و پڕیی لێبوو. ئەگەر لەو شوێنەی خۆم بمایەتمەوە، ئەوا دەیانکوشتم. ناچاربووم کە بەرەو ئەو دەوەنە چڕەی کە خۆم لێشاردەوە بچم. غیرەتم دایە بەرخۆم و توانیم بە نێو دارەکاندا خۆم بگەیەنمە دەوەنەکە. ئەوان نەیاندەتوانی من ببینن چونکە من لە نێو دەوەنەکاندا خۆم شاردبووەوە، بەلام من هەم دەمتوانی گوێم لە دەنگیان بێت و هەمیش دەمتوانی بیانبینم، بەڵام حاسیل بابام لێوە دیار نەبوو.

ڕێک لەبەر دەممدا، بەسێر خاتوون لەگەڵ کچە بچکۆلەکەیدا دانیشتبوون، لەگەڵ ئەوەی کە تەمەنی گەیشتبووە سیوپێنج ساڵ، بەلام ژنێکی گەنج، جوان و ڕێکوپێک بوو. شاڵێکی

ڕەشی بە نێوچاوانەوە بەستبوو کە پلپلەی ئاڵتوونی پێوە بوو، کراسێکی پەمەیی ئاوریشمی لەبەردابوو، پەڕۆیەکی شین ناوقەدی داپۆشیبوو، پشتێنێکی لەبان بەستبوو کە ڕەنگی شین، زەرد و سوور بوو. خەڵکی ناوچەکە بەو پشتێنەیان دەگوت کاشینگ. بەسێر خاتوون ترسابوو. لێوەکانی دەلەرزین و بە چرچەکانی نێوچاونیدا دیاربوو کە نیگەرانە. بە دڵەڕاوکێوە گوێم گرتبوو. ئەفسەرەکە پرسیاری لێ دەکرد:

- مێردەکەت لە کوێیە؟ منداڵەکانت لە کوێن؟

بەسێر خاتوون لە وەڵامدا دەیگوت کە هەفتەیەک لەمەوبەر منداڵەکانی لەگەڵ خۆی بردووە و چووە بۆ ئەلعەزیز. ئەفسەرەکە پێی پێدەکەنی و بەردەوام بوو:

- کەس هیچی پێ نەگوتوویت؟ ئەو سێ ڕۆژ لەمەوپێش لە مازگیرت کوژراوە! بەڵام ئەگەر تۆ بتەوێت دەتوانم منداڵەکانت ڕزگار بکەم.

بەسێر خاتوون هیچی نەدەگوت:

- ئەگەر ڕازی بیت شوم پێ بکەیت، ئەوا دەتوانم منداڵەکانت ڕزگار بکەم، حاسل بابا و ئەو دوو کارەکەرەش ئازاد دەکەم. وەرقەیان بۆ دەکەم، کە بتوانن بە کەیفی خۆیان بە هەموو ناوچەی دێرسمیدا بێن و بچن.

بەسێر خاتوون بە چیلکەیەک خەتی لەسەر زەویەکەی بەردمیدا دەکێشا. کاتێک گوێی لەو پێشنیازە نامرۆڤانە و بێ ئەخلاقیە بوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. خۆی گورج کردەوە و سەنگەری لە ئەفسەرکە گرت:

- خەجاڵەت نابیت؟ من ژنی مێردارم و پێنج منداڵم هەیە. ئەو کردەوە حەیوانییەی کە تۆ دەتەوێت لەسەر من تاقیبکەیتەوە لە چاوی هەموو مرۆڤێک و لە لای خواش نەفرەت لێکراوە!

ئەفسەرەکە وا هەستی دەکرد کە سووکایەتی پێکراوە. راستبووەوە، بەچوار دەوریدا خۆیدا خولایەوە و قیژاندی بەسەریدا:

- ئەگەر ئەوەی من پێم پێت دەڵێم، بەقسەم نەکەیت، ئەوا سەرەتا کچەکت، پاشان حاسل بابا و دواجاریش کارەکەرەکانت دەکوژم.

بەسێر خاتوون بەگژیدا چووەوە و بەبێ ئەوەی مل بۆ داواکەی کەچ بکات:

- بەسەر ئەفسەرەکەدا هاواری کرد، سەرەتا لە منەوە دەست پێبکە.

ئەو وەڵامەی بەسێر خاتوون وەکو خەنجەرێک بە نێو ڕۆحی ئەفسەرەکەدا رۆچوو، هاواری لە سەربازەکانی کرد:

- ئادەی ئەو دوو سەگە شەلە بێننە پێشەوە!

چوار سەرباز هاتن کە من بهێنن و چواریش چوون بۆ حاسل بابا. کاتێک کە زانیان من لەو شوێنەکەدا نەماوم کە دایان نابووم، بەپەلە خەبەریان برد:

- گەورەم، یەکێکیان ڕایکردووە.

ئەو چوارە بەجارێک شڵەژان. ئەوانی تر چوون حاساڵ بابایان هێناو پاڵیاندا بە دارێکەوە. ئەفسەرەکە، بەڕاکردنی من،

وەکو شێت و هاریی لێهاتبوو، وەکو شێتێک کەوتە تێهەڵدانی حاسل بابا، ئەو بەستەزمانە لەتاو ئازار لوول ببوو و کەوتە سەر زەویەکە، ئەفسەرەکە بەرزی کردەوە و پاڵیدایەوە بە دارەکەوە. دەمانچەکەی دەرهێنا و خستییە سەر نێو چاوانی و رووی کردە بەسێر خاتوون:

- ئێستا دەڵێ چی، بەڵێ یان نەخێر؟

حاسل بابا لەو کردەوە چەپەڵەی ئەفسەرەکە تێگەیشت، بە رقەوە رووی بەرەو بەسێر خاتوون وەرگێڕا:

- دایە، تف لە نێوچاوانی ئەم پیاوکوژە بکە! با هەموومان بە سەربڵندی بمرین. هاواری کردو، هەتا توانی مستەکۆڵەیەکی کێشا بە چەناگەی ئەفسەرەکەدا.

ئەفسەرەکە بە پشتا کەوت و حاسل باباش بە دەمدا. بۆ یەک چرکە ئەفسەرەکە عەقڵی خۆی لەدەستدا، دەمانچەکەی هێنایە سەرپێ و خستەیە سەر نێوچاوانی حاسل بابا. بەسێر خاتوون وەکو پڵنگێک بە منداڵەکەی باوەشییەوە، پەلاماری دا. بەسێر خاتوون وەکو کەسێکی تورە کە چاوی خوێنی تێزابوو، لەتاو ئازار لێوەکانی خۆی دەکرۆشت، هەتا لەتوانایدا بوو دەیقیژاند، بەڵام ئەفسەرەکە تەسلیمی ئەو کردەوەیەی بەسێر خاتوون نەبوو. منداڵەکەی لە باوەشی دەرهێناو رووی لەسەربازەکان کرد:

- ڕاوەستن، چیتان دەوێت بیکەن!

کە ئەوەیان بیست، بوون بە دوو بەشەوە، هەر گرووپەو پێنج کەس، چواردەوری کارەکەرەکانیان گرت و رووتیان کردنەوە. کاتێک سەربازەکان جلەکانیان لەبەر ژنەکان

دادەدڕی، دەستیان بە هاوارکردن کرد. یەک لە دوای یەک، تەجاوەزیان پێکردن. منی بێ چەک نەمدەتوانی شتێک بکەم جگە لە بینینی ئەوەی کە ڕوویدەدا، لە ناخەوە شەرمم لە خۆم دەکرد کە مرۆڤم. دەمویست بە نێو قوڵایی زەویدا بچمە خوارەوە. بە بێدەنگی دەگریام، تا گوێیان لێم نەبێت. نینۆکەکانم بە بەردەکاندا دەخشاند، خەریک بوو پەلاماریان بدەم. مردن زۆر باشترە لەوەی کە شایەتی بینینی تاوانێکی وا بیت. قاچە شەلەکەمم تاقیکردەوە، زانیم کە ناتوانم هیچ شتێک بکەم. وەکو ژنێک دەگریام و شەرمم لە خۆم دەکرد کە مرۆڤم. لە ناخی خۆمدا وەکو شایەتێکی بی دەسەڵات لەسەر ئەو ڕووداوە خۆم دەبینیەوە، وەکو ئەوە وابوو کە خۆم تاوانەکەم کردبێت. نەمدەتوانی هیچ شتێک بکەم، ئێ خۆ نەشدەمردم.

سەربازەکان جلەکانیان لەبەر کردەوە، لەبەرخۆیانەوە و فیکەی خۆشیان لێ دەدا، ژنەکانیش بە ڕووتی و بەبێ گیان کەوتبوون. بەسێر خاتوون ویستی بچێت منداڵەکەی بێنێت کە لای ئەفسەرەکە بوو، پاڵی بە دارێکەوە دابوو. ئەفسەرەکە وەکو سەگێک لیکاوی بەدەمدا دەهاتە خوارەوە. منداڵەکەی دانا و هەر کە بەسێر خاتوون هاتە پێشەوە، پاڵێکی بە منداڵەکەوە ناو ویستی بەسێر بگرێت، بەڵام هەتا توانی پاڵێکی پێوە نا، منداڵەکەش بە چوارچنگۆڵە خۆی گەیاندە باوەشی دایکی. ئەفسەرەکە پالاماری بەسێر خاتوونی داو، ویستی بیدا بە زەویدا. بەڵام بەسێر خاتوون توانی خۆی بگرێتەوە و دەستی لە بەردێک گیر بوو و ڕێک کیشای بە دەمووچاوی ئەفسەرەکەدا. بە دەم و چاوە خوێناویەکەیەوە لە گورگێک دەچوو کە لە نێچیرەکەی ڕازی بێت. دەستی برد

بۆ دەمانچەکەی، بەڵام دەستەکانی دەلەرزین، خستیە سەر سەری بەسێر خاتوون و دوو گەللەی لێداو کوشتی.

لاشەی شۆخ و شەنگ و بێگیانی بەسێر خاتوون لەسەر عەرزەکە گرمۆڵە بوو. تاڕادەیەکی وا شەرمم لە خۆم دەکرد، پێموابوو منیش لە نێو سەوزاییەکدا مردووم. بەڵام کە گوێم لەو فیشەکانە بوو کە نایان بە کارەکەرەکانەوە، تێگەیشتم کە هێشتا زیندووم. چاوم هەڵهێنا بینیم کە چۆن منداڵە بچووکەکە بە دوای دایکیدا هاواری دەکرد. ئەفسەرەکە کچە چکۆلەکەی گرت بە باوەشییەوە و شوێن هێزەکەی کەوت کە بە دوو ریز دەڕۆیشتن.

من لەو شوێنەی خۆم مامەوە کە پێم وابوو کات نەدەبڕایەوە، لە خوا دەپاڕامەوە کە بمباتەوە بۆ لای خۆی. شەرمم دەکرد بگەڕێمەوە بۆ نێو خەڵکەکە و پێم وابوو کە شێت دەبم. دانیشتبووم و فینگە فینگ دەگریام، نەمدەویست بڕوا بە چاوەکانی خۆم بکەم کە بووبوومە شایەتی ڕووداوێکی وا نامرۆڤانە. وام لەخۆم دەگەیاند کە هاوار و قیژەی قوربانییەکان کە لە گوێچکەمدا دەزرنگایەوە، شتێکی خەیاڵییە. دەمویست لەسەر پێکانم بووەستم بەڵام دەکەوتمەوە سەر زەوەی.

بە گاگۆڵکێ خۆمە گەیاندە ئەو شوێنە دەشتاییەی کە لاشەی بەسێر خاتوونی لێکەوتبوو. ئیتر تێگەیشتم کە ئەوەی بینیومە ڕاستییە، دەستم بە هاوار و گریان کرد. ڕاستییەکەی، تا خۆرئاوا نەبوو، نەمتوانی بێمەوە سەرخۆم. بەووردی دیقەتی بەسێر خاتوونم دا کە چۆن کەواکەی لەسەر زەویەکە کەوتبوو، قژە ڕەشەکەی بەسەر شانەکانیدا

پەخشبوو بوونەوە. لە شازادەیەکی نووستو دەچوو. لێی چوومە پێشەوە، ئەو شاڵەم لێکردەوە کە بەنێو قەدییەوە بەستبووی و لاشەکەیم پێ داپۆشی. یازمەکەیم کردەوە و لەگەڵ لەچککەیدا بەیەکەوە گرێمدان و چووم بە دارە گەورەکەمەوە بەست، تا بەیادی هەموو ئەو ڕێبوارانەی کە بەو ناوەدا تێدەپەڕین بهێنمەوە و تێیان بگەیەنم کە بەسێر خاتوون بووەتە قوربانی چی!.

وەک منداڵێک بەو ناوەدا دەخولامەوە، چووم بۆ لای لاشە بێگیانەکەی حاسڵ بابا کە لەسەر زەویەکە کەوتبوو. باوەشم پێدا کرد، ماچم کرد، دیسان دەستم بە گریان کردەوە:

- دە هەستەوە، برازا ئازاکەم، ئاخر تۆ نابێت بمریت.

سەریم نا بەسنگمەوە و نێوچاوان و ڕوومەتە کوڕانەکەیم ڕامووسی. کاتێکیش لە نێوەڕاستی مانگی گەرمی ئابدا، لاشە ساردو سڕەکەیم لەبەر دەستمدا بینی، ئیتر تێگەشتم کە مردووە.

فرمێسکەکانم کۆتاییان هات، دەتگوت چیدیکە هیچ ئیحساسێکم نەماوە. سەیرێکی کارەکەرەکانم کرد، بەبینی لاشەی ڕووت و قوتیان، هەستم بە خەجاڵەتی دەکرد، بۆیە ڕووی خۆمم وەرگێڕا. توانیم هەندێک لە جلە لەت و پەتکراوەکانیان کۆ بکەمەوە، تا بتوانم لاشەکانیانی پێ داپۆشم. پاشان بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ گوندی دێریک کە دەکەوتە دەشتایی پیرگردەوە، کاتێکیش لەوێوە بە پێوە وەستابووم، دەمتوانی خانووەکەی خۆمان ببینم.

بەو شێوەیە کۆتایی بە گێڕانەوەکەی عەلییە بچکۆلیش هات.

## ٦

دووکەڵی خانووە سوتاوەکانمان بە سەر ڕووباری گالبووساندا بەرز دەبووەوە. سەگەکەمان، سیتچۆ، دانی بەخۆیدا گرتبوو، وەکو ئەوەی کە بە مەبەست نەیەوێت بە سەربازەکان کە خانووەکانیان ئاگر تێبەردا، بوەڕێت، تا ژیانمان نەخاتە خەتەرەوە. چەندین جار دایکم بە تیلەی چاو تەماشای دەکرد و لێی دەپاڕایەوە کە دەنگی لێوە نەیەت، وا لێی دەپاڕایەوە وەکو ئەوەی ئەویش منداڵێک بێت.

کاتێک براکەم، کامێر، کە تەمەنی بیست ساڵێک دەبوو لەگەڵ مەمەدی کوڕی مستەفیا دەرویش هاوتەمەنی بوو، هەژدە ساڵان بوو، دوکەڵەکەیان بینی بوو، بە پەلە بەدوای ئەو شوێنەدا گەڕابوون کە ئێمە خۆمان لێ شاردبووەوە، بۆئەوەی دایکم قایل بکەن کە خۆمان لە شوێنێکی دوورتر لە نێو دارستانەکدا، بشارینەوە. بەڵام کوشتنی باوکم و سوتاندنی خانووەکەمان، دایکمیان خستبووە دڵە ڕاوکێوە، لە ئاست ئەو هەموو پاڕانەوەیە، خۆی کرد بە کەڕ. تەنها شتێک کە دووپاتی دەکردەوە:

- خۆتـان ڕزگار کـەن! ئـەوان هەمـوو دێکەیـان سـوتاند و حەیوانەکانیـان کۆکردینـەوە. بەمزووانـە جـێ پێـی ئێمـەش هەڵدەگـرن.

لەوکاتەی دایکم و براکەم قسەیان دەکرد گوێمان لە دەنگێکی نائاشنا بوو. سیتچۆ دەرپەڕی و بە وەڕین بەرەو گوندەکە ڕایکرد. لە دەرەوەی جەنگەڵەکە وەستا، پەلەماری هەرکەسێکی دەدا کە دەیویست لێی بێتە پێشـەوە. ئەو بەربەرەکانێی لەگەڵ مردن دەکرد، بەڵام دوای تەقەیەک پاشـەوپاش گەڕایەوە، جارێکی تر پەلاماری بردەوە، بەڵام بەبێ دەنگی و لە پڕێکدا ڕاوەستا. دایکم بەجارێک زراوی چوو:

- کەمەر، مەمەد، دەستوبرد کەن. بەرەو ئێرە دێن، ڕاکەن.

سـەرەتا براکـەم ملـی نـەدا، بـەڵام دوای ئـەوەی دایکـم بـە دەنگێکـی نیـوە خۆشەویسـتی و نیـوە هەڕەشـەوە ئـاگاداری کردنـەوە:

- ئەگـەر بەقسـەم نەکەیت ئـەوا تۆ بێ ڕێزی بە هەمـوو ئـەو قوربانیـەوە دەکەیـت کـە دایکێک ئامادەبێت بـۆ منداڵەکانـی بیـکات.

ئـەو سـزا دایکانەیـە وایلێکـرد شـەرم دایبگرێـت و لەگـەڵ هاورێکەی مەمـەد بە نێو جەنگەڵەکـەدا هەڵهاتـن. کاتێک دەنگی سـەربازەکان بـە تەواوەتی لێمـان نزیـک بـووەوە، دایکم دەسـتی بـە پاڕانـەوە لـە غەزالـی ژنـی بـرا گەورەکـەم سـولێمان کـرد:

- من ئاگام لە منداڵەکان دەبێت، تۆ خۆت ڕزگار بکە.

بـەو شـێوەیە ئەویش لـە نێو دارەکانـدا ونبـوو. ئێسـتا ئیتـر تەنهـا ژن و منـداڵ مابووینـەوە: دایکـم، خەجیجـە و برازاکانـم

کە منداڵی سلێمانی برام، خدرە چکۆل و براکەی دیکەم حەسەن عەلی بوو کە تەمەنی دە ساڵان بوو، فاتیمەی پوورم، خدری گەورە کە ئەویش تەمەنی دە ساڵان بوو لەگەڵ خوشکەکەی یەموش کە تەمەنی شەش ساڵان بوو، منیش تەمەنم هەشت ساڵان بوو. دایکم و پوورەکەم، بێوەژن بوون، ئاخر مێردەکانیان دوو رۆژ لەوەو پێش لە شاخی سپی کوژرابوون.

من و برازاکەم خدر، حەسەن عەلی برام و خدری گەورە و خوشکەکەی یەموش، زۆر بەینمان خۆش بوو. جاران بەیەکەوە بزنەکانمان دەلەوەڕاند، پاشان دەچوین بۆ سەر تاشەبەردەکانی نزیک ڕووباری گالبووسان بۆ یاری کردن. هەندێک جار ئێمە لەبەر خۆمانەوە دەگریاین بەڵام کە بەیەکەوە بوینایە هەمیشە پێدەکەنین. براکەم دەموچاوێکی نائاسایی هەبوو، چاو ڕەش بەڵام لوتێکی درێژیی پێوە بوو. کەوایەکی کچانەی لەبەر دەکرد، بەڵام ئەوە ڕێگر نەبوو لەوەی کە چۆن شوانێک سەرپەرشتی ڕانە مەرەکەی دەکا، ئاواش سەرۆکایەتی ئێمەی دەکرد. خدری گەورە کە وەکو دەستە ڕاستی وابوو، یارمەتی دەدا. بەڵام بە بەراورد لەگەڵ عەلی حەسەن، قەڵە و خاو و خلیچک بوو. تەنانەت نەیدەتوانی وەکو ئێمەی کچیش ڕابکات، بەڵکو هەناسەی سوار دەبوو، لە نیوەی ڕێگادا دەوەستا.

یەموش دوو ساڵ لە من بچوکتربوو، وەک پەرستن دەمپەرست. قژێکی کاڵ و دوو چاوی شین و ڕوومەتەکانیشی وەکو گوڵ وابوون. دایکمان هەمیشە یەک جۆر جلیان بۆ دەدورین و یەک جۆر مووروویان بە کەزیەمانەوە دەکرد.

ئەو ڕۆژە من و یەموش دەستی یەکترمان گرتبوو، براکەی من و براکەی یەموشیش، خدری گەورە، لەتەنیشت یەکترەوە وەستابوون. دایکم و پوریشم دەگریان. سەربازەکان حەزەریان دەکرد و بە حەزەروە بوون بۆ هاتنە ناو دارستانەکە، بەڵام کە دڵنیا بوون لەوەی ئێمە خەڵکێکی بێدیفاعین، چواردەوریان گرتین و ئامبازی دایکم و پورم بوون. ئێمە هەر ئەوەندەمان پێکرا دەست بە گریان بکەین. دایکم خەدیجەی هەڵگرتبوو و پوریشم خدری بچکۆلەی بە باوەشەوە بوو. لە قەراخ دارستانەکە چاوم بە سیتچۆ(سەگەکەیان) کەوت، جوڵەی لێوە نەدەهات. وامدەزانی ئەویش دوای ئێمە دەکەوێت. کە بینیم هیچ دەنگێکی لێوە نایەت، بانگێکم لێ کرد:

- سیتچۆ، ئەوە ئێمە دەڕۆین، تۆش دوامان بکەوە.

سیتچۆ بەبێ جوڵە لەسەر زەوەیەکە کەتبوو،ئیدی تێگەیشتم کە سیتچۆ مردووە، دەستم بە فینگە فینگ کرد، ڕامکرد بۆ لای دایکم و باوەشم پێدا کرد.

بەتەنیشت خانووەکەماندا ڕەت بووین، هێشتا دوکەڵ لە پەنجەرە ڕەشەکەوە دەهاتە دەرەوە. سەربانی تەویلەکەمان داڕوخابوو. گڕی ئاگرەکە سوورەچنارەکانی بەر ماڵەکەمانی سووتاندبوو، گەڵاکان وشک هەڵگەڕابوون. ئەو دارەی کە سیتچۆ لە بنیدا رادەکشا و منیش یاریم لێدەکرد، هیچی وای نەمابوو، بەقەد سیتچۆی مابووەوە. ئێستا ئیتر من دیلم و بەهەنگاوی منداڵانە بەرەو شوێنێکی نادیار دەڕۆین.

سەربازەکان ئێمەیان بەرەو گوندی Okh پێش خۆ دابوو، بە دڵنیاییەوە هەمان ئەو ڕێگایە بوو کە باوکم و گوندییەکانی دیکە پێیدا ڕۆیشتوون. سەربازەکان چاودێری ئێمەیان دەکرد،

هەموویان یەک جۆر جلیان لەبەردا بوو، چەک بەدەست و لوولەی تفەنگەکانیان سەرەنێزەی پێوە بوو. ئەوان سووکایەتیان بە دایکم و پوورم دەکرد. هەوڵی ئەوەیان دەدا کە وەڵامی پرسیارەکانیان بدەنەوە، ئەویش بە زمانێک کە ئێمە لێیان تێ نەدەگەیشتین، هەروەها ئەوانیش لە زمانی ئێمە نەدەگەیشتن. سەربازەکان نەیاندەزانی چی بکەن، بۆیە هەر کە توڕە دەبوون بە شێوەیەکی وەحشیانە هەڵسووکەوتیان لەگەڵ دەکردین.

براکەم حەسەن عەلی پشتێنێکی لەپشت بەستبوو و دەیتوانی بە هەنگاوی گەورە بڕوات، هەرچی هاوڕێکەی بوو، خدری گەورە هەموو گیانی لە ئارەق هەڵکشابوو، بەهۆی قەڵەویەکەیەوە نەیدەتوانی وەکو ئێمە بڕوات. من و یەموش دوای دایکم کەوتبووین و جاربەجارێکیش دەستمان بە کراسەکەیەوە دەگرت.

دەمەو ئێوارە بوو گەیشتینە سەر چۆمی گول کە دەکەوتە نێوان لووتکەی چیاکانی زارگۆڤیت و شاخی سپییەوە.

سەربازەکان ملوانکەکانی ملی دایکم و پورمیان پچڕاند، بەرەو و تەنکاییەکە بردینیان و ریزیان کردین. هەر تاو ناتاوێک دەوریان دەگرتین و لوولەی چەکەکانیان تێ دەکردین بەبێ ئەوەی بجوڵێینەوە. ئێستا ئێمە لە ناوەڕاستی هەردوو شاخی سپی و شاخی زارگۆڤیت دا وەستابووین، لەوەی یەکەمیاندا باوکمیان کوشتبوو، لەوەی تریشیان برا و براژنەکانم خۆیان لێ شاردبووەوە.

ئاسمانێکی شین، ساف و بێگەرد لە نێوان هەردوو لووتکەی ئەو چیایانەدا وەکو سفرەیەکی گەورە هەڵدرابوو. هەموو شتێک بە تەواوەتی وەستابوو. چیتر دەنگی سیرسرک

و پەلەوەرەکانیش نەدەبیسترا. خۆر لە پشت شاخی سپییەوە ئاوا بوو، خۆی ون کرد و سێبەری شاخی سپی تا دەهات باڵی بە سەرماندا دەکێشا. دایکم و پورم لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە ئێمەش لە هەمان شوێندا دەکوژن. وەکو شێتیان لێهاتبوو، بە دەنگی بەرز لە خواو پیرو پیاوچاکان و هەموو شتە پیرۆزەکان دەپاڕانەوە. هاوار و قیژەی ئێمەش تێکەڵ بە پاڕانەوەکانی ئەوان دەبوو. لە پڕێکدا کۆمەڵێک ژن و منداڵیان بەرەو تەنکایی چەمەکە ڕاپێچ کرد، ئێمە خۆمان لە یەکتری ترنجاندبوو. کاتێک دایکم و پوورم هەستانەوە تا بەربەرەکانێیان بکەن، چەند کەسێک لە گرووپەکە خۆیان راستکردەوە، سەربازەکان دەستیان کرد بە تەقە. دایکم سەرتاپا ترسی لێنیشتبوو، دەمی داچەقاندبوو و چاوەکانیشی ئەبڵەق ببوون. دایکم بەتەواوەتی شڵەژا بوو، منی بۆ لای خۆی راکێشا تا ئاگای لێم بێت. تەقەکان ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوون. وەختابوو لە ژێر دایکمدا بخنکێم. هەستم دەکرد دەست و قاچەکانم ئارەقەیان دەرداوە، بەڵام من هێشتا نەمزانیبوو کە دایکم و ئەوانی دیکە کوژرابوون و خۆیشم بریندار بووم.

کاتێک تەقەکان وەستان، هەستم بە شتێکی گەرم دەکرد کە بەسەر لاشەمدا دەهاتە خوارەوە، هەوڵمدا خۆم لە ژێر دایکمدا دەربهێنم بەڵام نەمتوانی. کە گەورەبووم مامە حەسەنم بۆی گێرامەوە کە چیمان بەسەر هاتبوو:

- من لەگەڵ خزمەکانم لە نێو دارستانەکانی زارگۆڤیتدا خۆمان شاردبووەوە. دەنگۆی ئەو هەواڵەم بەرگوێ کەوت کە برا گەورەکەم حوسێن و هاورێکانی بەیەکەوە کوژراون. هەر کە ئەوەم بیست دەستبەجێ بارگیرەکەم

زین کرد و بەتانییەکم هەڵگرت لەگەڵ مەمەد کەوتینە ڕێگا. بەقەراخ تاشەبەردەکانی چیایی زارگۆڤیتدا خۆمان گەیاندە گول و پەڕینەوە، پاشان بەرەو بەرزایی چیای سپی ڕۆیشتین. لە ڕێگا، پیاوێکی ڕیش چەرمووومان بینی کە خۆی لە نێو تاشەبەردەکاندا حەشار دابوو. کاتێک بۆی باسکردین کە چەند سەعاتێک لەمەوپێش سەربازەکان ژن ومنداڵی گالبووسانیان پێش خۆیاندابوو، لێرەوە تێپەڕین و پاشان یەک بە دوای یەکدا لە سەر چەمی گۆل هەموویان کوشتن. پێم وابوو خەریکە شێت دەبم. بارگیرەکەم گێرایەوە، بە غار بەرەو ئەو شوێنە چووین.

کاتێک گەیشتینە جێگا، بە چواردەوری خۆمدا ڕوانیم، بۆ ئەوەی دڵنیا بم سەربازەکان بۆ فرویودانمان لە نێو دەوەنەکاندا خۆیان نەشاردۆتەوە. پاشان بەرەو چەمەکە غارمدا، هەر هاوارم دەکرد تا بزانم کەسێک بەزیندوویی دەرچووە، بەڵام تەنها وەلامێک کە دەمبیستەوە، دەنگدانەوەی دەنگی خۆم بوو کە لە نێو تاوێرەکاندا، دەنگی دەدایەوە. هەر هاوارم دەکرد و دەڕۆیشتم، لە ناکاو گوێم لە دەنگی منداڵێک بوو. بانگی ئامۆزاکەم کرد: "وەرە بۆ ئێرە لەو لایەوە گوێم لە دەنگی منداڵێکە". کەمێک لەولا چەمەکەوە سێ منداڵم بینی کە هەرسێکیان ڕەنگیان پەڕیی بوو، دەگریان و پاڵیان بەیەکەوە دابوو. هەر لە ڕێوە هەرسێکیانم ناسییەوە: یەکەمیان تۆ بووی ئێما، کچی ئامینەی خوشکم، خدری بچکۆلە و خدری گەورە. لە تەنیشتیانەوە لاشەی ژن و منداڵی کوژراو کەوتبوون. لە نێو کارەساتێکی وا گەورەدا، بێدەستەڵاتانە نەمدەزانی چی بکەم. دەست و قاچم کەوتنە لەرزین و قوڕگم بە جۆرێک گیرابوو کە توانای گریانم نەبوو.

لە لاشەکان نزیک کەوتمەوە، هەوڵی ناسینەوەی چەند دەموچاوێکم دا. یەکێک لە ژنەکانم هەڵگێڕایەوە کە بە دەمدا کەوتبوو، کە بینیم ئەوە فاتیمەی خوشکە گەورەمە. هێشتا خوێن لە دەمییەوە دەهاتە دەرەوە، وەکو ئەوە وابوو کە تەماشام دەکات. بە هێواشی لە سەر پشت ڕامکێشا. پاشان ژنێکی دیکەم هەڵگێڕایەوە کە لەتەنیشتییەوە کەوتبوو، ئەویش ئامینە خوشکەکەی دیکەم بوو، دایکی ئێما، چاوەکانی کرابوونەوە. لەگەڵ ئامۆزاکەم بیست و سێ کەسمان ژمارد، کە هیچ نیشانەیەکی ژیانیان پێوە دیار نەمابوو. گەڕاینەوە بۆ لای ئەو سێ منداڵەی کە زەندەقیان چووبوو و دەیان ناڵاند، تا بزانین لەچ حاڵێکدان:

خدری گەورە سکی بریندار ببوو بە پشتێنەکەی خۆی بەستبووی. خدری گچکەش کەمێک خوێن لە دەمییەوە دەهاتە دەرەوە. ئێماش قاچێک و دەستی چەپی بریندار ببوو، خوێنی لەبەر دەڕۆیشت. خدری گەورەمان سواری بارگیرەکە کرد، ئێما و خدری گچکەشمان بە باوەش هەڵگرت.

کاتێک بە چیایی زارگۆڤیتدا هەڵدەگەڕاین تەواو لە دڵەراوکەدا بووین، کە گەیشتینە گوندی ئاریمان، خدری بچکۆلە دڵی لە لێدان کەوتوو و گیانی سپارد، هەر لەوێ بەهاوکاری خەڵکی گوندەکە بە خاکمان سپارد، دیسانەوە کەوتینەوە ڕێگا. نیوەشەو بوو کە گەیشتینە ئەو شوێنەی خەڵکەکە خۆیان لێشاردبووەوە. خەبەرە ناخۆشەکە وەکو بریسکەی ئاگر بڵاوبووەوە. خەڵکەکە وەکو شێتیان لێ هاتبوو، ژنەکان قژو دەموچاوی خۆیان دەڕنییەوە. برا و براژنەکانی ئێما و پیاوەکانیان و خزمەکانی دیکە بەردەوام دەگریان و مردووەکانیان دەلاوەندەوە.

سەرەڕای ئەوەی خدری گەورە برینداریش بوو، بەڵام کەوتە قسە و گێڕانەوەی ئەوەی کە چیان بەسەریاندا هاتبوو:

ئەو کاتەی کە سەربازەکان دەستیان بە تەقە کردن کرد من بە پێوە وەستابووم، پاشان بە پشدا کەوتم. هەر لاشە بوو بە چواردەورمدا و بە سەرمندا دەکەوتن. هەستم بە گەرمییەک دەکرد لە سکمدا، تێگەیشتم کە بەرکەوتووم. خۆم کرد بە مردوو بە بێ جوڵە لێی ڕاکشام. کەمێک دوای ئەوە دەنگی تەقەکان نەما، بیرم کردەوە کە ڕەنگە سەربازەکان ڕۆشتبێتن. بە هێواشی هەستامەوە و سەیرێکی چوار دەوری خۆمم کرد. هەرچی پێی بگوترێت نیشانەی ژیان لە لاشەکان نەدەهات. هەستم دەکرد سکم تەڕ و نەرم بووە. کە پشتێنەکەم کردەوە، ڕیخۆڵەکانی خۆمم لە نێو ورگە هەڵدڕاوەکەمدا بینی. هەوڵمدا هەرچۆنێک بووە کەمێک ڕێکیان بخەمەوە و پشتێنەکەم پارچە پارچە کرد و، برینەکەم پێ بەست. دوای ئەوە هەستامەوە و چومە نێو قوربانییەکانەوە، ئەوە بوو گوێم لە گریانی ئێما بوو. چووم بۆ ئەو شوێنەی دەنگەکەی لێوە دەهات. کەوتبووە ژێر لاشەی دایکییەوە، تەنها دەستێک و قاچێکی بە دەرەوە بوو. بەو بڕە هێزەی تێمدا بوو توانیم لە ژێر لاشەی دایکیدا دەری بهێنم. دوای ئەوە بەسەر پشتدا ڕامکێشاو بەردەوام بووم لە گەڕان، ئەوە بوو گوێم لە دەنگی منداڵی دیکە بوو، خدری بچکۆلە کە هێشا لە ئامێزی پوورە فاتیمە دا بوو. فاتیمە مردبوو، بەڵام هەوڵی پاراستنی منداڵەکەی دابوو. خۆی گرمۆڵە کردبوو و باوەشی بە منداڵەکەیدا کردبوو. ئەو منداڵە بچکۆلەیەم هەڵگرتەوە و لە پەنای ئێماوە دامنا. هەردووکیان دایانە پرمەی گریان، هێندەی نەبرد منیش بە دوایاندا دەستم کرد بە گریان.

کاتێک خدری گەورە لە تینوێتیدا لە گێرانەوەکەی وەستا و داوای ئاوی کرد، جامێک ئاومان بۆ هێنا، ئاوەکەی خواردەوە، بەڵام ئەویش هەناسەی لەبەر بڕاو مرد. چاوەڕێمان کرد هەتا خۆر هەڵهات، پاشان ئەویشمان بە خاک سپارد. لەو کاتەوە، ئێما، تەنها شایەتێکی زیندووە لەسەر کۆکوژییەکەی سەر چەمی گۆل، بەڵام ئەو سێ کونی بچکۆلە کەوتبوونە قاچە ئاوساوەکەیەوە، خوێنی دەستی ڕاستیشی نەدەوەستایەوە.

ژنی برا گەورەکەم، حوسێن، بۆخۆی دوکتۆرێکی کوردەواری بوو. ئەو ئاگای لە ئێما دەبوو. لە نێو جەنگەڵەکەدا جۆرەها گژوگیایی کۆدەکردەوە و ئاوەکەی دەگرتن، شێوەی شیریان دەدا پاشان لەگەڵ گژوگیای وشکدا تێکەڵی دەکردن. لەو دەرمانە جۆرە مەرهەمێکی دروست کردبوو کە برینەکەی پێ چەور دەکرد.

ئەو جۆرە دەرمانکردنە کاتی خۆی دەویست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا برینەکانی ئێما سارێژ بوون و دیار نەمان. بەڵام ئەو مەحکوم بوو بەوەی کە دەبێت تا دەمرێت بە قاچێکی نوقسان و دەستێکی ئیفلیجەوە بژی.

بەو شێوەیە کۆتایی بە گێڕانەوەکەی مامە حەسەنیشم هات.

## ٧

چەند هەفتەیەک دوای کۆکوژییەکە، لە ئانکاراوە پەیامێک بڵاوکرایەوە کە تێیدا هاتبوو لە ئێستاوە چیتر ئەو دەسەڵاتەی سوپا بەسەر ژیان و مردنی خەڵکی ناوچەی دێرسیمدا هەیەتی، نامێنێت. ئەو هێرشەی کە لە ژێر ناوی "ڕووبار" بە مەبەستی کۆکردنەوەی پیاوەکان لە ناوچە شاخاوییە جیاجیاکاندا و پاشان کوشتنیان پیادە دەکرا، هەروەها ئەو هێرشەی لە ژێر ناوی "بەفرماڵ" کە لە ڕاستیدا بە مانای کوشتنی هەموو ئەو ژن و منداڵانە بوو کە لە گوندەکاندا مابوونەوە، کۆتاییان پێ بهێنرێت. موختاری گوندەکان ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەیان پێ سپێردرا بوو، با هەموو ئەوانەی لە نێو شاخ و دارستانەکاندا خۆیان شاردبووەوە بگەڕێنەوە. براکانم گەڕانەوە بۆ گوندەکەمان، من و مامەکانیشم گەڕاینەوە بۆ لای ماما ئاغا. خانووەکەی وەکو شوێنێکی گونجاو و پەناگایەکی لێهاتبوو بۆ هەموو ئەو خێزانانەی کە ماڵەکانیان سووتێنرابوون.

برینەکانی قۆڵ و قاچم هێشتا ساڕێژ نەبووبوون، نەمدەتوانی بە ڕێگادا بڕۆم. هێشتا بە تەواوەتی نەگەیشتبووینەوە

گوندەکەمان، براکانم دەستیان بە درووستکردنەوەی خانووەکەمان کردەوە. لە نێو دارستانەکاندا داریان دەبڕییەوە و دەیانهێنایەوە. دیواری خانووە سووتاوەکەیان ڕووخاند و بەردەکانیان لەسەر یەک کەڵەکە دەکرد. شەوێکیان کە تازە لە کارە زەحمەتەکەیان ببوونەوە، دیسان سەربازەکان دایانەوە بەسەر گوندەکەماندا و براکانمیان لەگەڵ خۆیان دا برد.

موختاری گوندەکە دوای دوو ڕۆژ هەواڵی ئەوەی بۆ هێناین کە براکانم، سلێمان، سەید محەممەد، کامێر، موسا و داود، ناتوانن بگەڕێنەوە، چونکە ئەوان گیراون بە سەرباز. ئێستا ئیتر براژنەکانم بە تەنها بە بێ مێرد مابوونەوە، بۆیە بڕیاریاندا تا گەڕانەوەی مێردەکانیان بچنەوە بۆ ماڵی باوکیان. براکەی دیکەم حوسێن کە ئەوکاتە تەمەنی شانزە ساڵان بوو، چووە ماڵی خزمێکمان و لای ئەوان مایەوە.

ساڵێک بەسەر ڕۆیشتنی براکانمدا تێپەری، ڕۆژێکیان موختار، پارچە ئاسنێکی بۆ هێناین و دایە دەست حوسێنی برام، ناوی براکەم سەید محەمەدی لەسەر هەڵکۆڵرابوو، موختار بە براکەمی ڕاگەیاندبوو کە سەیدی برام لە کاتی سەربازیدا لە شاری سامسۆن کە دەکەوێتە سەر دەریای ڕەش، تاوانێکی کردووە، بۆیە سوپا بە هۆی ئەو پارچە ئاسنەی کە هەمانکات وەکو پێناسێک وابوو پێیان ڕاگەیاندین کە براکەم مردووە. گوندنشینەکان بڕوایان بەو شتەی کە بیستبوویان نەدەکرد، بۆیە هەموو بە جارێک هرووژمیان هێنابوو بۆ لای حوسێنی برام تا بە چاوی خۆیان پارچە ئاسنەکە ببینن. بەڵام کەس لە مانای ئەو پارچە ئاسنە نەدەگەیشت.

- یەکێک لە نێویاندا گوتی: کێ لە سوپا دەگات؟
- ئەوان پیاوەکانمان بە زیندووی دەبەن و لە جیاتی پیاوەکانمان پارچە ئاسنێکمان بۆ دەنێرنەوە.

دوو ڕۆژ تێپەڕ بوو بەسەر ئەو خەبەرە ناخۆشەدا کە هەواڵی گەڕانەوە براکانمان بە مەرەخەسی بڵاوبووەوە، یەک بەدوای یەکدا هاتنەوە، لە خۆشیاندا شاگەشکە بووین. ئەو مەرەخەسییە بۆ ئەوە بوو کەمێک پشوو بدەن و بێنەوە سەر خۆیان. فیلێک لە دەموچاویاندا خۆی حەشار دابوو. چاو روومەتەکانیان بە قوڵدا چووبوون. تەواو ماندوو شەکەت بوون، تەنیا ئێسقانەکانیان مابووەوە. بە گوێرەی ئەوەی بۆیان باسکردین ئاو و هەوای ئەو ناوچەیەیی کە سەربازییان لێکردبوو ببووە هۆی ئەوەی تاقەتی خواردنیان نەمێنێت و بەزەحمەت هەناسەیان بۆ بدرێت. زۆر زۆر دەکۆکین و لە نیوە شەودا خەبەریان دەبووە وە، وەکو ئەوەی لە ئارەقدا مەلە بکەن. دوای ماوەیەک هێندە لاواز بوون کە نەیانتوانی بوو لەسەر پێکانیان بوەستن، بۆیە سوپا بڕیار دەدات بیاننێرێتەوە بۆ ماڵەوە:» ئاو و هەوای گوندەکەی خۆتان باشترە بۆ ئێوە. ئێستا بڕۆنەوە و هیوای چاکبوونەوەتان بۆ دەخوازین!»

لەگەڵ ئەوەی ئەوان زۆر لاواز و بێ هێز بوون، دیسانیش دەستیان بە تەواوکردنی خانووەکەمان کرد، لەو شوێنەی بە ناچاری پێیان بەجێهێشتن، تێهەڵچوونەوە. بەڵام تەندروستیان ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو. بە بەردەوامی دەکۆکین و خوێنییان هەڵدەهێنایەوە. گوندییەکان هەرزوو هەستیان بەوە کرد کە توشی سیل هاتوون. نەخۆشییەک کە لە چاوی

ئەوانەوە بە پلەی یەکەم تووشی ئەو کەسانە دەبوو کە تووشی خەموخەفەت و چەرمەسەری هاتبن.

براکانم نەیانتوانی بەرگەی خەمی کۆکوژییەکەی چیایی سپی و چەمی گوڵ بگرن، نەیانتوانی ئەو عەزابە لەبیر بکەن، نەیانتوانی چاوە کراوەکانی دایکم و لاشە نیوە بۆگەنکردووەکەی باوکم، خدری بچکۆلە کە بە بەردەوامی خوێنی لەبەر دەڕۆیشت، باڵ و قاچە ئیفلیجەکەی من، لەبیر بکەن. هەروەها ئەوان نەیانتوانی بوو بەرگەی زیندانی سەربازیی و ئەو ئەشکەنجەییەی کە ڕووبەڕویان کرابووەوە، بگرن.

هێندە سووکایەتیان پێکرابوو کە نە هیوایان مابوو نە ڕۆح. هەموو هەواڵێکی ناخۆش وەکو چەقۆیەک دەچوو بە نێو دڵیاندا. ئەوەی کە بەزۆر ئەوانیان لە گوندەکەمان و خزم و کەسووکاریان دوورخستبووەوە، هەروەها بانگ کردنیان بۆ سەربازیی، بەبێ ئەوەی داوای لێبووردنیان لێ بکەن، ببووە بارێکی قورس بەسەر شانیانەوە.

هەموو خەڵک خۆیان بە شەریکی ئازاری براکانم دەزانی، لە خودا دەپاڕانەوە کە شیفایان بۆ بنێرێ. بەڵام هەموو کەسیش دەیزانی کە بە دوعا چاک نابنەوە.

لە کۆتایی وەرزی بەهاردا، بە جارێک تەندروستی براکانم بەرەو خراپی دەچوو. لە نێو جێگاکەیاندا هەڵنەدەستانەوە، هەتا دەهات لاوازتر دەبوون. هەروەک چۆن بە دوای یەکدا هاتنەوە، یەک بەدوای یەکدا کۆچی دواییان کرد، لە ماوەی یەک هەفتەدا، چوار گۆڕی تازە لە گۆڕستانەکەی ئاوایی زیادی کرد.

خۆم کۆکردەوە و بۆ دواجار چووم بۆ سەر گۆڕی براکانم، دایک و باوکم و خەدیجە.

سوێندم خوارد:

- شەرت بێت تا ماوم ڕوونەکەمەوە گوندی گالبووسان.

دوای ئەوە بە شەلە شەل گەڕامەوە بۆ لای ماما ئاغا.

# ١

سالانمان بەسەر برد. مامەم حەسەن بوو بە سەرپەرشتی من و خەریک بوو هەژدە ساڵم پڕ دەکردەوە. دوای ئەوەی سوێندم خوارد، جارێکی دیکە سەر بە گالبووساندا نەکەمەوە، جار بەجارێک کە سەفەرم دەکرد، چاوم بە لووتکەکانی چیای زارگۆڤیت هەڵدەهێنا، خەم دایدەگرتم و فرمێسک بە چاوانمدا دەهاتە خوارەوە. زۆرجار شێوەی دەموچاوی دایکم و یەموش و سەگەکەمان سێتچۆ لە کاتی وەرپییندا، دەهاتەوە بەر چاوم. زۆر جار ئەو دەموچاو و دەنگانەم بە بیر خۆم دەهێنایەوە.

گەلێک جار مامم بەجێ دەهێشت و دەڕۆیشتم. هەتا ئەم ساتەش، تەنها مەگەر خوا و خۆم بمانزانیایە کە بۆ ئاوا دێ بە دێ دەگەڕێم. جا با بۆت ڕوون بکەمەوە. ڕاستییەکەی ئەوەی من بەدوایدا وێڵ بووم، دەمویست بزانم کە ئەو ڕوداوانەی کاریگەرییەکی قوڵیان لە سەر ژیانی منداڵی من دانابوو، چین، دەمویست وەڵامی ڕووداوەکان وەربگرمەوە و زیاتریان لە سەر بزانم.

کە بە خۆم و قاچە شەل و قۆڵە ئیفلیجەکەمەوە بۆ هەر شوێنێک بچومایە، گوندنشینەکان بە پیر و جوانیانەوە باوەشیان بۆ دەکردمەوە. ئاخر ئەوان حسابی کەسێکی نزیکی خۆیان بۆ دەکردم، هیچ کاتێکیش دەستیان بە ڕوومەوە نەدەنا، گرێی دڵی خۆیان بۆ دەکردمەوە، نهێنیەکانی خۆیان بۆ باس دەکردم، هیچیان لێ نەدەشاردمەوە.

بۆ خۆم هەتا بڵێی کچێکی جوان بووم، دەموچاوێکی جوان و قژێکی لوولی درەوشاوەم پێوە بوو. کاتێک لە هەر کەسێک نزیکبوومایەتەوە، هەر کە قاچە شەل و قۆڵە ئیفلیجەکەیان دەبینیم، نارەحەت دەبوون و بەزەییان پێمدا دەهاتەوە.

ڕۆژێکیان چووم بۆ گوندی هاڤیک، گوندێک بوو کەوتبووە ناوچەیەکەوە، خەڵکێکی زۆری لێ دەژیا، نزیکەی سەعات و نیوێک لە ماڵی مامەوە دوور بوو. بە دوای کاکۆی مووزەرد دا دەگەڕام، ئەو کاتە تەمەنی شەست و پێنج ساڵێک دەبوو، بەڵام گورجوگۆڵ بوو و تەندروستیشی باش بوو. هەموو ڕووداوەکانی لە بیر مابوو، لە بیرو هۆشدا لە فیلێک دەچوو. زۆربەی ئەوانەی کە لە تەمەنی ئەودا بوون تا بیانتوانیایە خۆیان لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو دەپاراست. بەڵام ئەو هەموو شەوێک باسی ئەو بەسەرهاتانەی دەگێڕایەوە کە بەسەری هاتبوو. باسی کۆکوژییە ترسناکەکەی ساڵی ١٩٣٧ – ١٩٣٨ ی دەکرد، باسی سەرۆک عەشیرەو بەرهەڵستکارە قارەمانەکانی دەکرد، بەڵام هەمانکات باسی خائینەکانیشی دەکرد. وشە بە وشە ڕوداوەکانی شیدەکردەوە وەکو ئەوەی کە ئەمڕۆ ڕوویاندابێت، بەوردی باسی ئەو کۆبوونەوانەی

دەکرد کە خۆی بەشداری تێداکردبوون. ئەو ئێوارەیەی من میوانی بووم، بیست کەسێک بە ژن و پیاوەوە، بە پیرو گەنجەوە کۆبووبوونەوە، بە چیچکانەوە گوێیان بۆ ئەو ڕووداوانە شل کردبوو کە بۆی دەگێڕاینەوە. لەبەر ڕووناکایی چرایەکی ساکاردا، چەند سەرینێکی خستبووە پاڵ خۆی و لە سەر چرپایەکی تەختە دانیشتبوو، تەماشای گوێگرەکانی دەکرد. هەر لەیەکەم نیگادا، چاوە گەورە و سمێڵە فشەکانی کاریگەری و سەرنجی خەڵکیان بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. پانتۆڵێکی ڕەش و کراسێکی سپی لەبەردابوو، بەڵام بۆینباخی نەبەستبوو، جامانەیەکی دابوو بەسەر شانی دا، بەم شێوەیە لە یەکەم وشەوە دەستی پێکرد:

پایزی ١٩٣٦ بوو، سەید ڕەزا، سەرۆکی عەشیرەتی کورشێخان، سەید حوسێنی بانگهێشت کرد بۆ کۆبوونەوەیەک لە سەر کانی "دزەکان". ئەو ڕۆژە ئێمەش هەموو لەگەڵ سەید حوسێن ئەسپەکانمان زین کرد و لێماندا و ڕۆیشتین. کە گەیشتینە ئەو شوێنە، ئەسپەکانمان بە دارێکەوە بەستەوە. دوای ئەوەی لە سەرچاوەکە ئاومان خواردەوە و دەموچاوی خۆمان فێنک کردەوە، دەستمان بە جگەرە پێچانەوە کرد، ئاخر هەموو دەمانزانی کە سەید ڕەزا بۆ کارێکی گرنگ بانگی ئێمەی کردووە. سەید حوسێن، لەسەر تاشەبەردێکی نزیک کانییەکە، دانیشت و جگەرەیەکی داگیرساند، مژێکی قوڵی لێدا، دووکەڵەکەی لە دەمیەوە هێنایە دەرەوە و بەو ناوەدا بڵاوی کردەوە. پەشکۆکاو دیاربوو. جامانەیەکی ڕەنگ قاوەی فستانی لەسەر کردبوو، جامانەیەکیشی دابوو بەسەر شانیدا. مژێکی تری لە جگەرەکەی داو، بانگی کردین بۆ لای خۆی:

- دەزانم سەید ڕەزا ئێمەی بانگ کردووە تا لەسەر شتێکی گرنگ قسەمان لەگەڵ بکات. دەبێت بە وردی گوێ لە قسەکانی بگرین، تا بزانین لە ئانکارا و لە ناوچەکەمان، چی ڕوودەدات.

ویستی لە قسەکانی بەردەوام بێت، بەڵام لە پڕ چاومان بە کۆمەڵێک ئەسپسوار کەوت، سەید ڕەزاشیان لە نێودا بوو، بۆیە قسەکانی خۆی بڕی. هەموو هەستاینە سەر پێ تا ڕەشوەی ئەسپەکانیان بگرین و دابەزن. ئەوان لە ئێمە زۆرتر بوون. تەوقەمان لەگەڵ یەکتر کرد و ئەملاو لای یەکترمان ماچ کرد، بەخێرهاتنمان کردن. ئەسپەکانمان بەستەوە و گەڕاینەوە بۆ سەر کانییەکە.

سەید ڕەزا تەمەنی حەفتاو سێ ساڵ بوو، ڕیشێکی درێژیی خۆڵەمێشی بەردابووەوە، بە خۆی و چاوە تیژ و شانە پان و پۆرەکەی و سەرحاڵ بوونی، وای لێکردین بڕوای تەواومان پێی هەبێت. دوای هەواڵ پرسین و کەمێک باسی ڕووداوەکان، کاک عەلی لەلای ڕاستیەوە و سەید حوسێنیش لەلای چەپییەوە دانیشتن. ئێمەیش بە ئیحترامەوە، بە چیچکانەوە، لە شێوەی نیو بازنەیەکدا دانیشتین و گوێمان بۆ قسەکانیان شل کرد.

سەید ڕەزا ،سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد و دووجار قوڕگی پاکردەوە، پاشان بە دەنگێکی مێرانە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەرمونیان بە زاراوەی زازاکی دەستی بە قسەکانی کرد:

برا خۆشەویستەکانم، ئێمەی خەڵکی دێرسیم، سەدان ساڵە لە نێو ئەم چیا و دێهات و کۆمەڵگەیەی خۆماندا دەژین،

خوا دەزانێت هیچ کاتێک ئێمە زوڵمان لە کەس نەکردووە، بە پێچەوانەوە ئێمە زۆرجار کەتووینەتە بەر پەلاماری خەڵکی. دوازدە ساڵە ڕژێمی ئانکارا، کوردەکان ڕاودەنێت، ئێمە هەوڵمانداوە بێلایەن بین، دەمانگوت ئەگەر ئەوان وازمان لێ بهێنن ئەوا ئێمەش هەقمان بەسەریانەوە نابێت. ئەوەبوو هاتن خەڵکی بێتاوانی کۆچگریان کوشت، ئێمە تەنها داڵدەی ئەوانەیانمان دا، کە بە زیندوویی ڕزگاریان بوو. ئێمە چاوی خۆمان نوقاند لە ئاست کوشتنی کوردە زازاکانی پالۆ، پیران، گەندج و دیاربەکر لە ساڵی ١٩٢٥. بەهەمان شێوە لە کاتی کۆکوژییەکەی زیلان و ئاگری لە چیایی ئارارات لە ساڵی ١٩٢٧، بێدەنگەمان لێکرد. لەو کاتەوە دەوڵەت هەموو ناوچە کوردییەکانی خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، تەنها دێرسیم نەبێت، ئێستا دەیانەوێت ئێرەش داگیر بکەن. دەیانەوێت چەکمان بکەن و کۆتایی بەو هەموو عادات و تەقالیدەی کە سەدان ساڵە پاراستوومانە بهێنن، زەویەکانمان داگیر بکەن، زمانەکەمان کە سێ هەزار ساڵە قسەی پێ دەکەین قەدەغە بکەن، گەنجەکانمان بە زۆر بەرن بۆ سەربازی، بە یاسا بمانکەن بە "تورک"، بە زۆر یانیش لە ڕێگای ڕیفۆرمەوە بە خۆیانمانەوە گرێ بدەن، باج و سەرانەمان لێ بستێنن. لە ڕابردودا، ئێمە توانیومانە پاشەکشە بە سەلجوقیەکان و عوسمانییەکان بکەین، تەنانەت باب و باپیرە وەحشەیەکانیشیان، جەنگیزخان و تەیمور لەنگ نەیانتوانیوە پێ بنێنە سەر چیاکانمان، ئەی کەواتە ئێستا چۆن دەبێت لە بەردەمی نەوەکانیاندا سەر نەوی بکەین؟ بە بڕوای من ئێمە هەڵەیەکی کوشندەمان کرد کە ئەو نۆزدە ساڵە، بێلایەن بوونمان هەڵبژارد ڕژێمی ئانکارا، خۆی لە داگیرکردنی

دێرسیم بوارد، بەو شێوەیە کەوتینە نێو ئەو داوەی بۆیان نابووینەوە. ئێستاش کە سەرهەڵدانی زازا و کورمانجییەکانیان تێکشاندووە، ئێمە بێ پشت و پەنا ماوینەتەوە.

ئێمە ئەگەر بەربەرەکێیان بکەین یان نا، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، چونکە ئەوان هەر هێرش دەکەنە سەرمان. ئێستاش پرسیارەکە ئەوەیە: لە بەردەم ئەم شەلاقکارییەدا، چی بکەین؟

دەمەوێت بۆچوونی ئێوەش بزانم. بەو شێوەیە کۆتایی بە قسەکانی هێنا، بەوردی کەوتە سەرنجدانمان.

ئێمە بە بێ دەنگی سەری خۆمان داخستبوو. پاشان سەیرێکی سەید حوسێنمان کرد کە بەناوی ئێمەوە، بەوپەڕی ڕێزەوە دەستی بە قسەکردن کرد:

- سەرۆکی ئێمە، ئەوەی کە جەنابتان فەرمووتان هەمووی ڕاستە، من تەنها دەتوانم گەواهی بۆ تەواوی وشەکانت بدەم. ئێمە دژی دەوڵەتی ئانکارا و سوپا نین، بەڵام ئەوان دەیانەوێت بمانکەن بە کۆیلەی خۆیان، وڵاتەکەمان داگیر بکەن. هەروەک ئێوەش گوتتان، نابێت بە کەس بڕوا بکەین. تەنها شتێک کە ئێمە داوای دەکەین، شاخ و عەشیرەتەکانمانە. درەنگ یان زوو هەر دەکەوینە بەر ئەو قامچییەی کە تۆ باستکرد، بەڵام ئایا ئێمە دەبێت چی بکەین؟

بەو ئەزموونەی کە هەمانە، سوپا نایەوێت هەوڵی ئەوە بدات کەلێنێک بخاتە نێوان سیواس، کۆچگری و ئەرزنجانەوە. ئەوان لە هێلی بەرگری پالۆ تا دەگاتە خاربووت، هێرشمان دەکەنە سەر. ئێوە کە سەر بە عەشیرەتی شێخ حەسەنن،

هەرچۆنێک بێت دەتوانن پەنا بۆ شاخەکان بەرن، بەڵام ئێمە کە دەکەوینە نێو دەشتاییەکانی دێرسیمەوە، هیچ پەنایەک شک نابەین، دەکەوینە بەر هێرشی ئەوان. لە حاڵێکی وادا، ژن و منداڵەکانی ئێمە دەبنە قوربانی. ئەگەر ئێمە لەگەڵ تورکەکاندا بکەوینە شەڕەوە و بە بڕیار بین کە نەهێڵین پێ بنێنە ناو خاکی دێرسیمەوە، ئەوا من پێشنیارێکم هەیە!

سەیرێکی سەید ڕەزای کرد کە بەتاسەوە گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو:

- فەرموو، ئێمە لە پێشنیارەکەتان پێشوازی دەکەین، سەید ڕەزا پێی گوت.

سەید حوسێن بەردەوام بوو لە قسەکانی:

من پێموایە، سوپا لە پاڵو و خاربووتەوە هێرشمان دەکاتە سەر، پێویستە ئێمەش بە درێژای ڕووباری موراد، هێڵێکی پارستن دابنێین، تا ڕێگا لە سەربازەکان بگرین پێ بنێنە نێو خاکی دێرسیمەوە.

سەید ڕەزا، پێشنیارەکەی سەید حوسێنی ڕووبەڕووی ئەو سەرۆک عەشیرەتانە کردەوە کە لەگەڵ سەید حوسێندا هاتبوون.

بەشێکیان پشتیوانیان لێ کرد:"سەرۆکی ئێمە، قسەی تۆ قسەی ئێمەشە، تۆ دەتوانیت بە ناوی ئێمەشەوە بڕیار بدەیت". ئەوانی دیکەیان لەگەڵ پێشنیارەکەدا نەبوون" هەر عەشیرەتە دەتوانێت عەشیرەکەی خۆی بپارێزێت".

ئەو قسانە بە دڵی سەید ڕەزا نەبوون:

- نەخێر، سەید حوسێن ڕاست دەکات، با بیر بکەینەوە و ڕێگایەکی دادپەروەرانە بدۆزینەوە، ڕووی دەمی لە وانە کرد کە لەگەڵیدا هاتبوون: ئەگەر عەشیرەتەکانی دێرسیم ناچار کران پەنا بۆ ئێمە بهێنن بە خۆیان و ژن و منداڵیانەوە، دەبێت ئێمە بیانپارێزین؟
- وەکو پیاو هەموو گوتیان بەخێر بێن.

سەید ڕەزا خۆشحاڵی خۆی نیشاندا:

- خوا بتان پارێزێت! خوا لە هەموو بەڵاو قامچییەک بتانپارێزێت.

دوای ئەوە ڕووی کردە سەید حوسێن تا بزانێت ئەو چۆنی پێباشە. ئەمەش پێویستی بە کەمێک کات هەبوو بۆ بیرکردنەوە. سەید ڕەزا کەمێک شڵەژا و ڕووی کردە کاک عەلی بەرتی کە لای دەستی ڕاستییەوە دانیشتبوو:

- کاک عەلی خۆشەویست، ئەگەر پیاوێکی زاڵم بیەوێت بریندارت بکات، تۆ لە بەرامبەریدا چی دەکەیت؟،ئەمەی بەو هیوایە گوت تا بەڵکو سەید حوسێن بێدەنگیەکە بشکێنێ:
- کاک عەلی بەرتی بە کورتی وەڵامی دایەوە:
- گەورەم، لە دەستی ڕادەکەم.

سەید رەزا کەمێک دەنگی بەرز کردەوە:

- پیری من، ئەو ناکەس بەچەیە، بۆ هەر کوێیەک بڕۆیت وازت لێناهێنێ.

کاک عەلی بەرتی خۆی بێ دەنگ کرد. کاتێک سەید حوسێن بینی یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی کە لەگەڵ

سەید ڕەزا هاتووەوە وا قسە دەکات، بێدەنگیەکەی شکاند و بە هەستێکی شانازی بەخۆکردنەوە هەستایە سەر ئەژنۆ و هاواری کرد:

- لێی دەدەم هەتا دەیکوژم.

سەید ڕەزا بەم وەڵامە، هەستی بە شانازییەکی گەورە کرد، وەکو نیشانەی خۆشحاڵبوونی دەستی ڕاستی خستە سەر دڵی:

ئەوەیە قسە، پیری من، ئەوەی گوت و بەردەوام بوو لە قسەکانی: ناوی تەنها یەک جێگام پێ بڵێن کە پەنای بۆ ببەین لە بەرامبەر ئەو ناپیاوەی کە وەک نموونە هێنامەوە تا منیش بێمە سەر قسەکانی ئێوە. ئەم بیرکردنەوەیە بە شێوەیەکی وا کاری کردە سەرمان کە هەموو سەرمان داخست. وەکو کۆتایی هێنان بە کۆبوونەوەکە داوای لێ کردین کە لە کۆبوونەوەی داهاتوودا، هەڵوێستی خۆمان دیاری بکەین. خواحافیزیمان لەیەکتر کرد و کانی "دزانمان" بەجێ هێشت.

ماوەیەک بەسەر ئەو کۆبوونەوەیەدا تێپەڕی، زستانێکی تا ڕادەیەک بێ قڕەمان بەسەر برد. بەڵام دەنگۆی ئەوەی کە دەوڵەت پەلە لە خۆئامادەکارییەکانی دەکات بۆ هێرشێک لە بەهاردا، بڵاوببوەوە، بۆیە ئێمەی خەڵکی دێرسیم بڕیارمان دا، پێشنیارەکەی سەید ڕەزا قبووڵ بکەین. هێشتا زۆر بە سەر بڕیارەکەی ئێمەدا تێنەپەڕی بوو، سەید ڕەزا بۆ کۆبوونەوەیەکی دیکە بانگی کردینەوە. ئەمجارەیان بڕیاربوو لە سەرچاوەکانی هالبۆرد، لە قەراخ ڕووباری مونزوور، کۆبوونەوەکە بکەین. ڕۆژێک دواتر لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی کورشێخان سواری ئەسپەکانمان بووین و

بەڕێ کەوتین. لە ڕێگا لە نزیک تەپەی کێرت بۆ حەسانەوە لاماندا، ئەسپەکانمان بەستەوە و لە دەوری سەید حوسێن کۆبووینەوە.

دەشتاییەکی پان و بەرین لە بەردەماندا ڕاکشابوو. لە دووری ئەویشەوە چیا سەرکەشەکان بەرزبووبوونەوە، بەفری سەر چیاکان دەستیان بە توانەوە کردبوو. مونزوور بە خوڕ دەهاتە خوارەوە، کەس نەیدەوێرا خۆی لێبدات. هاژەی ڕووباری مونزوور وەکو ئاوازێکی خۆش دەهاتە گوێمان. لە نێو زەویە شێدارەکەدا گیا سەری هەڵدابوو، ئەو ناوە هەمووی بە گوڵی ئالاو والای هەمەڕەنگ داپۆشرابوو. باڵندە و مێش هەنگ خەریکی تامکردنی سەرەتای بەهار بوون. دانیشتنەکەمان خۆشبوو، سەید حوسێن بە خۆی و کیسە تووتنەکەیەوە لە بن دارێکدا دانیشتبوو، دەستی بە قسەکردن کرد:

هاوڕێیان، وەکو ئەوەی دیتە بەرچاومان دەڵێی هەموو شاخی توژیک لەگەڵ ئێمەدا بێت. هەر چل نەغمەکە و جێگا پیرۆزەکان و خزر بابا و مونزوور بابا، گوێیان لە ئێمە گرتووە، "بابا" خۆی دەمانپارێزێت. من نە دایک و باوک، نە برا و نە هیچ سەروەت و سامانێکم هەیە. ئێوە هەموو شتێکی منن، هەر بۆیە بڕوام پێتان هەیە، هەموو هێزێکی من لە ئێوەوە سەرچاوە دەگرێت. تا ئەو کاتەی پشتیوانیم بکەن و پەیمان و بەڵێنەکانتان بەجێ بهێنن، دەمەوێت بە ناوی ئێوەوە قسە بکەم. پاش تاوێکی دیکە چاومان بە سەید ڕەزا و پیاوەکانی لە دێمانان و یووسفان، دەکەوێت. هەموو ئەو زستانی ڕابردووە گفتوگۆمان لەسەر پێشنیارەکەی

سەید ڕەزا کردووە، هەر یەکێکیش لە ئێوە قسەی خۆی کردووە. ئێستا دەمەوێت بۆ دواجار گوێم لە دوا قسەی ئێوە بێت، تا هەموومان خاوەنی یەک قسە بین، پێشنیاری خۆمان بخەینە بەر دەستیان. بەڵام بۆ جارێکی دیکەیش بە بیرتان دەهێنمەوە، هەر کە سوپای تورک پێی نایە نێو خاکی دێرسیمەوە، دەست بە قەتڵ و عامی ژن و منداڵاکانمان دەکەن، گوندەکانمان کاول و وێران دەکەن و لە نێو وڵاتی خۆماندا ڕاومان دەکەن. پێشنیاری من بۆ ئێوە ئەوەیە کە ژن و منداڵەکانمان بدەینە دەست عەشیرەتە چیانشینەکانی سوڵتان بابا، سەندچک و سۆسین. کە ئەوەشمان کرد، ئەوەی توانانی چەک هەڵگرتنی هەبێت و تەمەنی بۆ شەڕ کردن دەست بدات، ڕووبەڕوی سوپای تورک دەبینەوە. ئێوە ئەگەر ئەم پێشنیارەتان پی باشە یان نا، ئێستا قسەی خۆتان بکەن! یانیش پێشنیارێکی دیکە بکەن.

سەید باکیل، مێردی بەسێر خاتوونی کوژراو، وەڵامی دایەوە:

- قسەی تۆ قسەی ئێمەشە، سەید حوسێن.

سەید حوسێن قسەکەی لە دەم وەرگرتەوە و سوپاسی هاوڕێکانی کرد:

- دووجار گوتی خوا دەست بە باڵتانەوە بگرێت! ئێستاش با بڕۆین بۆ لای سەرۆکی خۆمان.

کاتێک گەیشتینە لای کانیەکانی هالبۆرد، سەید ڕەزا کە ژمارەیەکی زۆری چەکداری لەگەڵدا بوو، چاوەڕوانی ئێمەیان دەکرد. هەر کە چاوی بە سەید حوسێن کەوت هەستایە

سەرپێ تا پێشوازی لێ بکات. هەردووک سەید وەکو ڕسومێکی بەخێرهاتن ئەملاو لای یەکتریان ماچ کرد. لەوبەر ڕووبارەکەوە ژمارەیەکی زۆر چەکدار و سەرکردە دیارەکانی دەمامان و یووسفان وەستابوون. بەهۆی هاتنی بەهار و توانەوەی بەفری سەر چیاکان، رووباری مونزوور هەستابوو و پەڕینەوە خەتەرناک بوو. ئەوەش وایکرد بوو کە نەتوانین هەمووماں بەیەکەوە کۆبینەوە. بۆ ئەوەی بتوانین لەیەک بگەین، یەکتری بدوێنین، بڕیارماندا دەم بە دەم لەمەبەر بۆ ئەو بەر قسە بکەین.

سەرەتا سەید ڕەزا و سەید حوسین بە خێرهاتنی یەکتریان کرد، پاشان کەوتنە پەسندانی گابرێل ئاغا سەرۆکی هۆزی دەمامان، ئەویش بە ئەدەبەوە لەوبەر ئاوەکەوە وەڵامی دانەوە:

- دەستەکانتان ماچ دەکەم، خوا تەمەن درێژتان کات. پاشان بەردەوام بوو:
- ئێمە دەمانەوێت هەواڵێکتان پێ ڕابگەیەنین و هەمانکات پێشنیارێکیشتان بخەینە بەر دەست، تا هەڵوێستی خۆتانی لەسەر وەربگرن!

پێنج ڕۆژ لە مەوبەر، بەتالیونێکی سوپای تورک لە ناوچەی سوان بارەگایی خۆیان لێ خستووە و پردێکی گەڕۆکیشیان لەسەر ڕووباری ماردچیک داناوە. بەبێ بیرکردنەوە فەندیک ئاغا، فەرمانی بە پیاوەکانی دابوو کە بڕۆن پردەکە بسوتێنن، ئەوانیش بەقسەیان کردبوو. ئەمەش وای لە سەربازەکان کردبوو زارەترەک ببن، سەری خۆیان هەڵگرن و ڕاکەن. بەڵام زۆری پێ ناچێت سوپا ئەو هەقەمان لێدەکاتەوە و

هێرشمان بۆ دەهێنن. ئێستاش پێویستە لەسەر هەموومان کە بە یەکگرتووی خۆمان بۆ شەڕێکی بەرەنگاربوونەوە ئامادە بکەین. ئێوە پێتان چۆنە؟ دەبێت هەر ئێستا وەلاممان بدەنەوە، پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد تا هەموومان گوێمان لێ بێت.

سەید ڕەزا وەکو باوکێکی خۆشەویست وەستابوو، خۆی زۆر بە نزیکی گابریل ئاغا دەزانی، بۆیە هەوڵیدا ئارامی بکاتەوە:

- لە سەرخۆبە، گوێمان لە قسەکانت بوو، جارێکە هیچ مەکەن! تورکەکان گایەک ناکەن بە قوربانی بزنێک.

گابریل ئاغا وەلامی دایەوە:

دیارە ئێوە بۆتان ڕوون نەبۆتەوە کە چی بووە.

سەید ڕەزا جارێکی تریش ویستی ئارامی بکاتەوە:

ڕووخاندنی پردێک یان کوشتنی کاپتنێک هەموو دونیا نییە. ڕەوشەکە ئارامەو نابێت کۆنترۆڵی خۆمان لە دەست بدەین. بەلام ئەو قسە نەرمانەی سەید ڕەزا نەیانتوانی گابریل ئاغا ئارام بکەنەوە:

- ئەوان ئەو هێرشەی ئێمە بێ وەلام ناهێڵنەوە، گابریل ئاغا وایگوت!

دیسانەوە سەید ڕەزا هەوڵی ئارامکردنەوەی گابریل ئاغای دایەوە:

کریڤی (کریف بە مانای برای شیری یانیش ئەو کەسەی کە منداڵی برادەرێکی لە کاتی خەتەنەکردندا لەسەر کۆشی خۆی دادەنێت و دلۆپێک خوێن بەر جلەکانی دەکەوێت.

وەرگێڕ) خۆشەویست خۆتان ناڕەحەت مەکەن، ئەوان چۆن هاتوون هەر واش دەگەڕێنەوە.

کاتێک گوێی لە وەڵامی سەید ڕەزا بوو، گابریل ئاغا جارێکی تریش بیری کردەوە! پێش ئەوەی پشتی ڕاست بکاتەوە، پشتێنەکەی کردەوە و دای بەسەر خۆیدا و ڕاکشا. سەید ڕەزا بە چاکی لەو نیشانەیەی گابریل ئاغا تێگەیشت. ڕووی کردە سەید حوسێن:

- گلێنەیی چاوەکانم، کاتمان بە دەستەوە نەماوە. ئێوە دەبێت لە بەینی خۆتاندا گفتووگۆی ئەم مەسەلەیەتان کردبێت. ئێستاش دەمەوێت بزانم دوا قسەی ئێوە چییە؟ سەید ڕەزا بەبێ قەرارییەوە ئەمەی بە سەید حوسێن گوت.

سەید حوسێن بێ دوو دڵی کردن وەڵامی دایەوە:

با جارێکە من بڕیاری عەشیرەتی خۆمانت پێ بڵێم: ئێمە کەسووکارەکانی خۆمان بە ئێوە دەسپێرین و خۆشمان شان بە شانی ئێوە لە قەراخ کەنارەکانی مورادەوە دەجەنگین.

سەید ڕەزا تامەزرۆی وەڵامێکی وابوو، بۆیە ڕووی تێکردین گوتی:

هاوڕێیان، لە ئێستاوە ئێمە هەموو برایی یەکین. ئەوەتا وا لە تەنیشت چیای سوڵتان بابا و ڕووبەڕوی ڕووباری مونزووری پیرۆز، وەستاوین. چاو بە چاو لە گەڵ مەلیکی زەنبوورەکان، ئامانجمان گەیشتنمانە بە کەعبەمان، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ئێمە چاوەڕێمان دەکرد. ئیتر لە ئێستاوە دەبێت منداڵەکانمان، خزمەکانمان، ئاژەڵەکانمان یەکبگرن. چیاکانیشمان دەمانپارێزن. ئیتر ئازار چەشتن بەسە. ڕۆژێک

هەر دێت کە چارەنووس وەکو زەردەخەنەیەک بەڕووماندا بدرەوشێیەوە.

ڕووی کردە سەید حوسێن:

دەبێت هەرچی زووترە، کۆسۆغلۆ لە ڕووداوەکان ئاگادار بکەینەوە، هەروەها دەبێت پیلڤونکەکان، فێرات و کاربالەکان خۆیان چەکدار بکەن و پەیوەندیمان پێوە بکەن. کەسوکارەکانی خۆتان بنێرنە نێو چیاکان و ئەوەشی دەستی چەک بگرێت، با خۆی چەکدار بکات. دەبێت هەموو هەوڵێکی خۆمان بدەین تا کۆنترۆڵی ئەو ناوچانە بکەین کە لە مێردمیکەوە درێژ دەبنەوە تا دەگاتە موراد.

سەید حوسێن بەسەر نیشانەی ڕەزامەندی نیشاندا و دەستی بۆ گابریل ئاغا درێژ کرد کە تا ئەو کاتە بە پشتدا خۆی خستبوو پشتێنەکی دابوو بە سەر خۆیدا و دەوری مردوویەکی دەبینی.

- کریڤەکەی تۆ هێشتا خۆی کردووە بە مردوو. دەبێت لەو بڕیارەی خۆمان ئاگاداری بکەینەوە تا جارێکی تر خۆی زیندوو بکاتەوە.

سەید ڕەزا بۆ خۆی دەستی بە قسانکرد:

- کریڤی من، هەستەوە سەرپێ. ئێمە بڕیاری خۆمان داوە. تا چەند ڕۆژێکی دیکە خۆمان ئامادە دەکەین. کاتێکیش هەموو شتێک کۆتایی پێهات، ڕەنگە گۆڕەکانی من و تۆ و سەید حوسێن لە تەنیشت یەکەوە هەڵکەنن، یانیش ڕەنگە هەر گۆڕیشمان بە نسیب نەبێت، کێ دەزانێت؟ بەڵام هەموو شتێک لەوە باشترە کە کرنووش بۆ چەوسێنەران ببەین.

پێویستی بە وشەی زیاتر نەکرد تا گابریل ئاغا هەستێتەوە و بێتە سەر قەراخی ڕووبارەکە:

- سوپاستان دەکەم بۆ ئەو بڕیارەی کە داوتانە! یەکگرتووی دێرسیم لە هەموو شتێکی تر پێویستترە. بەداخەوە ئەم ڕووبارە پیرۆزە، ئێمەی لە یەکتر دابڕیوە و ناتوانین لە تەنیشت یەکەوە سوێند بۆ ئەم پەیمانەمان بخۆین، مەگەر نیشانەیەک بۆ بەڵێنەکەمان دابنێین، دەنا جگە لە خەفەتخواردن هیچ شتێکی ترم لە دەست نایەت.

ڕاستی دەکرد، ڕووباری مونزوور ئێمەی لەیەک جیاکردبووەوە، سەید ڕەزا بەردەوامی بە قسەکانی دا:

- بەڵام ئەی چی بکەین چاکە؟

گابریل ئاغا وەلامی دایەوە:

کریڤە بەڕێزەکان، من هەموو سەرۆک عەشیرەتەکانم لەگەڵدایە. جگە لە دەربڕینی خۆشحاڵی خۆمان بۆ بڕیارەکەی ئێوە، شتێکی ترمان بۆ ناکرێت. ئێستاش کە بە پشتیوانی خوا لە تەنیشت ئەم ڕووبارە پیرۆزە و لە پەنای چیای سوڵتان بابا وەستاوین، هەموو سوێند دەخۆین کە یەکگرتوو بین و لەیەکتر جیانەبینەوە. ئێستاش وەک نیەت پاکیمان هەر یەکێک لە ئێمە بەردێک دەهاوێژینە نێو ئاوی پیرۆزی مونزوورەوە، تا ئەگەر یەکێک لە ئێمە پەیمان و بەڵێنی خۆی بەجێ نەهێنا، با بکەوێتە بەر نەفرەتی ئاوی پیرۆز.

سەرۆک عەشیرەتەکان ئەو پێشنیارەیان قبوڵ کرد و هەریەکەو بەردێکی فڕێ دایە نێو ئاوەکەوە. کاتێک خواحافیزیمان لەوانەی ئەو بەری ڕووبارەکە کرد، هیوای

سەفەرێکی خۆشمان بۆ خواستن، هەموو هەستاینەوە. سەید ڕەزا و سەید حوسێن باوەشیان بەیەکتردا کرد. سەید ڕەزا لە خۆشیاندا شاگەشکە ببوو، گوتی:

- سەفەرێکی خۆش پیری من، ڕێگای بەردەمتان هەمیشە کراوە بێت. خوا پشت و پەنای هەموومان بێت، بەوشێوەیە بەجێمانهێشتن.

سواری ئەسپەکانمان بووین و هەریەکە بەرەو گوندی خۆمان گەڕاینەوە. لە ڕێگا لە کێرت کە دەکەوتە سەر ڕێگاکەمان لاماندا. سەید حوسێن لە ئەسپەکەی دابەزیی و بەستیەوە و لەسەر تاشەبەردێک دانیشت، وەک هەمیشە جگەرەیەکی پێچایەوە و ئێمەش هەموو دانیشتین. بەڵام سەید باکیل کە لەپێش ئێمەوە ئەسپەکەی بەستەوە، چوو بۆ لای سەید حوسێن و بە دەنگێکی بەرز تا هەموومان گوێمان لێ بێت کەوتە قسە:

- بچینە سەر چیا؟ نازانم تۆ چۆن توانیت بیر لەوە بکەیتەوە ژن و کچەکانمان بنێرینە لای سۆین و سندچاکەکان؟ چۆن ڕوومان بێت و چاومان هەڵبێنین ئەگەر یەکێکیان لە چکەکەی لە سەر سەری لابەرێت؟ ئێمە ماڵ و حاڵی خۆمان بەجێ ناهێڵین! بەسەر سەید حوسێندا هاواری کرد: چییە دەڵی تێکچویت؟

سەید حوسێن وەکو پەڕۆیەک ڕەنگی زەرد بوو، دەستەکانی بەشێوەیەک کەوتنە لەرزە جگەرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە. بە چاوێکی پڕ لە فرمێسکاویەوە خۆی کۆکردەوە:

پێش ئەوەی سەید ڕەزا ببینین لێتان پاڕامەوە چیتان لە دڵدایە بیڵێن. هیچکامێکتان ناڕەزایەتیتان دەرنەبڕی. تۆ یەکەم کەس بوویت کە بڕیارەکەت پەسند کرد. ئێستا دەتەوێت من چی بکەم؟ جگە لەوەی لە خوا دەپاڕێمەوە ئێوەش بە دەردی ئەرمەنییەکان بچن و هەمان چارەنووسی کۆچکردنتان بە نسیب بێت، شتێکی دیکەم نییە بیڵێم. بە تەواوەتی پەشۆکابوو. بە دڵێکی بریندارەوە هەستایە سەرپێ و سواری ئەسپەکەی بوو بەرەو ماڵەوە.

ناکۆکی نێوانیان ڕابردوویەکی دوور و درێژی هەبوو. عەشیرەتی ئێمە گەورەترین و کۆنترین عەشیرەتی دێرسیم بوو. کەس نەیدەزانی لە کەیەوە باب و باپیرانمان بارگەو بنەیان لە ناوچەکانی دەواڵ بیل هەڵدابوو، ژیانێکی کامەرانیان بەسەر بردبوو، عەشیرەتەکە گەورە ببوو. لە ماوەکانی دوایدا خەڵکێکی زۆری سەر بە عەشیرەتەکەمان زیاتر لە ناوەڕاستی دێرسیم و گوندەکانی دەورووبەری نیشتەجێ ببوون. ئێمە لە گوندی بچوک بچوکدا دەژیاین و خەریکی ئاژەڵداری بووین.

هێشتا من گەنج بووم، مورتۆ باس، باوکی سەید باکیل سەرۆک عەشیرەتمان بوو. ژنەکەشی خەزاڵ کەسێکی دەست و پل ڕەنگین بوو، سەر بە عەشیرەتی یەکێک لەو خێڵانە بوو کە عەشیرەتی یووسفانیان پێک دەهێنا بە ناوی تچێکخان، هەموو ئەندامانی عەشیرەتەکە باسی شۆخ و شەنگی ئەویان دەکرد. سەرەتا شووی بە پیاوێک لە خزمەکانی سوور کردبوو کە خەڵکی گوندی هالبۆری بوو، مێردەکەی لە شەڕێکی عەشایەریدا کوژرابوو، بە بێوەژنیش چووە بەر دڵی سەید کێکۆ، بەڵام ئەو بەمەرجێک شووی پێ دەکرد

کە دەبوو یەکێک لە عەشیرەتەکەی خۆی بکوژێت، بەو شێوەیەش خەزاڵ دەیویست هەقی برا کوژراوەکەی بکاتەوە.

سەید کێکۆ شەرتەکەی بەجێ گەیاند و کەسێکی سەر بە عەشیرەتەکەی خۆیانی کوشت. ئیتر بەو جۆرە سەید کیکۆ بووە سەرپەرشتی سەید باکیلی باوک کوژراو. بە کوشتنی میترۆ باس عەشرەتەکەمان ناچار بوو سەرۆکێکی نوێ بۆ خۆیان هەڵبژێرن. سەرەتا بیریان کردەوە کە سەید کێکۆ بکەنە سەرۆکی خۆیان، بەڵام ئەو کەسێکی کوشتبوو لە پێناوی ئەوەی ژنی سەرۆکی پێشووی عەشیرەتەکە لە خۆی مارە بکات، ئەم تاوانەش دژی داب و نەریتی ئێمە بوو، بۆیە ئەو لە چاوی ئێمەوە بۆ سەرۆک عەشیرەتی دەستی نەدەدا؛ ئەو نەیتوانی ببێتە سەرۆکی ئێمە. پیرە حوسێن کە لە هەموان بە تەمەنتر بوو، وەک سەرۆک هەڵبژێردرا، بەڵام زۆری پێ نەچوو وازی هێنا. جارێکی دیکە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکێکی نوێ کۆبوونەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا پیرە حوسێن خۆی ناوی سەید حوسێنی هێنا بیکەنە سەرۆک عەشیرەت، ئەوەش بە هۆی داوێن پاکی، جددی بوون، کامڵبوون و زیرەکی و هەستی دادپەروەریتییەوە بوو. هێشتا سەید حوسێن گەنج بوو کە دایک و باوکی مردبوون، لە لایەن خزمەکانییەوە بەخێو کرابوو، نزیکایەتی لەگەڵ موترۆ باس هەبوو، زۆر جاریش وەکو ڕاوێژکار بەشداری کۆبوونەوەکانی عەشیرەتەکەی دەکرد. ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو کە ئەزموونی سەرپەرشتی هۆزەکەی هەبوو. سەید حوسێن ژیانێکی ساکارانە دەژیا، خانوویەکی بچکۆلەی سێ ژووری لەگەڵ پارچە زەوەیەکی بچکۆلەی لە گوندی چاڵکارین هەبوو.

پیاوێکی بە هەیبەت و باڵابەرز و بەهێز بوو، دوو برۆ و سمێڵێکی گەورەی پێوە بوو. شارەزاییەکی باشی لە بەرێوەبردنی خێڵەکەماندا هەبوو، هەرئەوەش وایلێکردبوو کە لای ئێمە خۆشەویست بێت. بەگوێرەی زۆربەی سەرچاوەکان ئەو کێشەیەی لەسەر کانییەکانی هالبۆر هاتە ئاراوە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە سەید باکیلی قبوولی ئەوەی نەدەکرد، سەید حوسێن وەکو ئاغای خۆی حسابی بۆ بکات، هەربۆیە بڕیارەکانی دەخستە ژێر پرسیارەوە. تەنانەت باسی ئەوە دەکرا، هەوڵی دابوو دەرمان خواردووی بکات. سەید باکیل پێیوابوو، مافی ئەو بوو، وەکو میراتییەک لەدوای باوکی خۆی ببێت بە سەرۆک عەشیرەت و جێگای بگرێتەوە. بەڵام لە نێو عەشیرەتەکەی ئێمەدا وا باو بوو کە نابێت سەرۆکایەتی لە باوکەوە بۆ کوڕ بمێنێتەوە، بەڵکو دەبوو بە هەڵبژاردن بێت. بەڵام سەید باکیل بە جۆرێکی دیکە لەمەسەلەکەی دەڕوانی، کاتێکیش ئێمە پێمانگوت بۆچی ئەو کارەی کرد، ئاوا وەڵامی دایەوە:

"من هەمیشە ڕێز و ئیحترامم بۆ سەید حوسێن هەبووە و ڕێزی بڕیارەکانیشیم گرتووە، تەنها شتێک کە من لێی ناڕازیبووم بەشێک لەو بڕیارانە بوو کە لەسەر کانییەکانی هالبۆرت دایان. ڕاستە من لە سەرەتادا لە تێگەیشتنمەوە لەگەڵ بڕیارەکەدا بووم، بەڵام لە کۆبوونەوەکەدا ئەوەم لا بەرجەستەبوو کە بەرژەوەندییەکانی دێرسیم گرنگیەکی زیاتریان پێدرا وەک لە بەرژەوەندیەکانی عەشیرەتەکەمان، پێموایە ئەوە زەرەر بە داهاتوومان دەگەیەنێت". لە ڕێگای گەڕانەوەماندا ئیحساساتم جولا، ئەوە بوو بۆم ڕوونکردەوە کە ئێمە گوندەکانی خۆمان بەجێناهێڵین. مەبەستم لە ڕاگرتنی

ئەو بڕیارانە نەبوو کە لە دژی سوپای تورک دران و بیانخەمە ژێر پرسیارەوە".

کێکۆیی موو زەرد لە گێڕانەوەکەی ماندوو ببوو، سوپاسی کردین:

ئەمشەو قسەم زۆر بۆ کردن، هەموو ئەم شتانە قەتماخەی سەر برینەکانمان هەڵدەداتەوە. ئێستاش پێویستیم بە حەسانەوەیە، هەستایەوە و دیوەخانەکەی بەجێهێشت و چووە ژوورێکی دیکەوە.

## ٢

خانووەکەی مامە حەسەنم بە بەردی سپی دروستکرابوو، لەسەر ڕێگایەکی قەرەباڵخ بوو. وەکو شوێنی ئیسراحەتی ڕێبوارانی لێهاتبوو، واتە هەمیشە پڕ بوو لە میوان. ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ باس و خواس و دەمەتەقەی ئێواران بە تایبەتیش لە وەرزی زستاناندا. ئێمە کەڵکمان لەو میوانداریانە وەردەگرت، دەکەوتینە پرسیار کردن لە میوانەکان، هەرچییەکیان باس دەکرد کەڵکمان لێوەردەگرت. لە یەکێک لەو ئێوارانەدا، کاکە کالی، کە خەڵکی گوندی کورەسپی بوو، بەمشێوەیە باسی کۆتایی ژیانی سەید حوسێنی بۆ گێڕاینەوە:

بەهاری ساڵی ١٩٣٧، سوپا توانی بارگەو بنەی خۆیان لە دەشتەکانی دێرسیم هەڵبخەن. چەند شەڕێکی بچوکی لێدەربچێت، ئەو هێزانە ڕووبەڕوی هیچ بەرگرییەک نەبوونەوە. سوپا زیاتر لە چیانشینەکان دەترسان، هەربۆیە چەند شوێنێکیان قایم کردبوو. بە هێواشی لە دەشتەکانەوە سەردەکەوتن تا بتوانن پلانەکانیان جێبەجێ بکەن. دوو بارەگایان لە مازگیرت و خۆزان دامەزراند. دوای ئەوە دوو هێزی دیکەیان هێنا، فیرقەی بیست و پێنج لە تورشمیک و

فیرقەی چل لە پاخەهاڤیکی. کەسێک لە نێو سەرکردەکانیاندا هەبوو بە ناوی ئیسماعیل هاکیی، پیاوێکی دڵڕەق بوو، وەکو ئاگری ژێر کا وابوو و زیرەکیش بوو. کاتێک بۆی دەرکەوت کە کۆنترۆڵی بەسەر ناوچەکدا هەیە، هەوڵی دابوو پەیوەندی بە سەید حوسێنەوە بکات تا لە مەرام و پلانەکانی ئاگادار بێت. بەو مەبەستەش خۆی و ستافەکەی و وەرگێڕێک بەرەو چاکتارین دەکەونە ڕێگا، لە ڕێگا پرسیاری ماڵی سەید حوسێن دەکات. سەید حوسێن میوانداری دەکات و خواردنیان بۆ ئامادە دەکەن بە دۆی کوردەوارییەوە، پاشان ئەفسەرەکە لە ڕێگای وەرگێڕەکەیەوە لەگەڵیدا دەکەوێتە قسەکردن:

سەیدی خۆشەویست، من خۆم بە کەسێکی بێگانە نازانم لە دێرسیم و خەڵکێکی زۆریان لێدەناسم، خۆشمدەوێن و ڕێزێکی زۆریان لێدەگرم. من دەمەوێت لە خزمەتی ئێوەدابم، هەر بەو مەبەستەش هاتووم بۆ ئێرە. دەوڵەت لە بەرنامەیایەتی قوتابخانە و ڕێگا و بانتان بۆ بکاتەوە، گەرانتی ئەوە بکات کە ئارامی هەیە و کۆتایی بە شەڕی عەشایەری و خوێن ڕشتن بێت، هەمانکات چەکەکانیش کۆ بکاتەوە. هیوادارم کە تۆ لە ڕێکخستنی کاروبارەکاندا هاوکاریم بکەیت، خۆ ئەگەر ئێوە بتانەوێت ئەوا من دەتوانم بە جەنراڵ عەبدوڵڵا پاشا یانیش بە گازی، موستەفا پاشا، کەمال موستەفا سەرۆک کۆمارتان بناسێنیم.

سەید حوسێن تورکی دەزانی هەر بۆیە قسەکانی بە وەرگێڕەکە بڕی:

ئەفسەر، خوا تۆی کردووە بە میوان لە ماڵەکەی مندا. بەخێربێن! من ناتوانم بە ناوی هەموو عەشیرەتەکانی

دێرسیمەوە قسە بکەم، بەڵکو دەتوانم تەنها وەک خۆم و بەناوی خۆمەوە قسە بکەم. دێرسیم ناوچەیەکی هەژار و سادەیە، ئەم ناوچەیە بەو سادەییەی خۆی رازییە، خەڵکی ئێرە نەدەمەقرێیان دەوێت و نەشەڕ، هەروەها ئێمە دژی ئەوە نین کە ڕێگاو بان و قوتابخانەمان بۆ بکەنەوە، بەدڵنیاییەوە ئێمە دەمانەوێت منداڵەکانمان بە زمانی دایکیان بخوێنن. هەروەک دەزانرێت عەشیرەتەکان هەموویان بە دژی یەکتری دەجەنگن، بەڵام ئەمە بە دەرەجەی یەکەم کێشەی نێوخۆی خۆیانە، هەمانکات ئەم کێشانە مێژوویەکی سەد ساڵەیان هەیە شتێک نین کە هەروا بە ئاسانی چارەسەر بکرێن، وەک چۆن شتێک نین کە بە تەواوەتی بنەبڕ بکرێن.

کاک ئەفسەر، من دەمەوێت بزانم کە چی لە پشت ئەم هەوڵەی ئێوەوەیە؟ پیاوێک کە لەگەڵ ئەفسەرەکەدا بوو هەرچییەکیان بگوتایە دەینووسیەوە. ئەفسەرەکە هەوڵی شاردنەوەی ڕق و کینەی خۆی داو بە شێویەکی نەرمونیان کەوتەوە قسەکردن:

سەید حوسێنی ئازیز، وا هەست دەکەم تۆ بڕوا بە من ناکەیت. من سەربازم و ڕێک و ڕاست قسە دەکەم، مەبەستم خراپەکردن نییە. ئێستاش من لەگەڵ تۆ وەکو هاوڕێیەک قسە دەکەم. من فەرمانم بە هەموو پیاوەکانم داوە کە لەم ناوچانەی ئێوە حەرەسیات دەگرن، بە ئیحترامەوە مامەڵە بکەن، لە خۆیانەوە هیچ کەسێک نەگرن کە دژایەتیمان ناکات و تەنانەت پێم گوتوون کە دەبێت پارەی ئەو پاروە نانەش بدەن کە لە خەڵکی داوای دەکەن. ئەگەر کەسێکیش بیەوێت ڕینیشاندەریمان بۆ بکات دەستەبەجێ ئاگادارمان بکەرەوە.

سەید حوسێن، باش لەوە گەیشتبوو کە ئەفسەرەکە دووڕوویی و ڕیایی بۆ دەکات، بۆیە نەیوویست لەسەر ئەو مەسەلەیە بەردەوام بێت و بابەتەکەی گۆڕی. هەموو ئەو شەوە دانیشتن و جار بە جارێک قسەوباسێکیان دەکرد. کاتێکیش شەو درەنگی کرد، داوای کرد کە جێگا بۆ ئەفسەرەکە رابخەن، پاشان شەو باشی لێکرد. بەڵام ئەو بۆ خۆی خەو نەچووە چاویەوە، جگەرە لە دوای جگەرە دایدەگیرسان، بیری لەو ڕەوشە نالەبارە دەکردەوە. لە پڕێکدا خەیاڵ و دالغە بردیی بۆ لای سەید ڕەزا. پرسیاری لە خۆی دەکرد کە دەبێت خێڵەکانی دیکە وەزعیان چۆن بێت، لە کاتێکدا ئەو بۆ خۆی نەیتوانی وەعد و بەڵێنەکانی خۆی بباتە سەر. سوپا هەموو پەیوەندییەکانی پچڕاندبوو، ژن و منداڵی عەشیرەتەکەیان کە لە دەشتایەکاندا مابوونەوە و کەوتبوونە ژێر دەستی داگیرکەرەوە. تەنانەت سوپا توانیبووی بەشێک لە دانیشتووان بە لای خۆیدا رابکێشێت و هەموویان چەکەکانیان تەسلیم بە سوپا کردبوو.

بەیانی زوو پێش خۆر هەڵهاتن، پێش ئەوەی سەید حوسێن بچێت دەست بە ئاو بگەیەنێت، گوێ بیستی دەنگێک دەبێت لە دەرەوە و نیگەرانی دایدەگرێت، کە دەچێتە دەرەوە گوێی لە کۆکەیەک دەبێت و ئەویش بەرەو لای دەنگەکە دەڕوات، چەند قنچکە جگەرەیەک دەبینێ کە هێشتا نە کوژابوونەوە. بەبینینی ئەو سەربازانەی کە چوار دەوری ماڵەکەیان گرتبووە دەحەپەسێت. بە پەلە دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو ژوورەی ئەفسەرەکەی لێ نووستبوو، سەرەتا دەیەوێت خۆی بچێتە ژوورەوە و خەبەری بکاتەوە، بەڵام پاش کەمێک بیرکردنەوە ژنەکەی دەنێرێت بە دوای وەرگێرەکەدا کە لە

ماڵی داروسێیەکیان خەوتبوو. پاش تاوێک وەرگێڕەکە لەگەڵ دوو پاسەواندا پەیدا دەبن، کە دەبینێت سەید حوسێن زۆر تووڕەیە، لە دەرگای ئەفسەرەکە دەدات و داوای لێدەکات ئارامی بکاتەوە. بە تووڕەییەوە سەید حوسێن بەسەر ئەفسەرەکەدا هاوار دەکات:

- بۆچی سەربازەکانت چواردەوری ماڵەکەمیان گرتووە؟

ئەفسەرەکە بە شێوەیەکی گاڵتە ئامێزانەو بێ ئەدەبانە دەڵێت:

خۆت نارەحەت مەکە سەیدی بەڕێز، ئەوان بۆ بۆ پارێزگاری ئێمە لە دەرەوە وەستاون.

ئەو وەڵامە هێندەی دیکە سەید تووڕە و نارەحەت دەکات:

- ئێوە لە ماڵەکەی مندا میوانن، من خۆم بەرپرسیاری ماڵی خۆمم، دەبوو بتزانیایە هەتا لە ژێر بانی ماڵەکەی مندایت کەس دەستت بۆ ناهێنی، بۆ بەو شێوەیە هەڵسووکەوت دەکەن؟

ئەفسەرەکە سەیرێکی سەعاتەکەی دەستی کردو گوتی:

- کەمێکی دیکە خۆر هەڵدێت و دنیا ڕووناک دەبێتەوە، ئێمە دەبێت بڕۆین. جارێکی تر چووەوە ژوورەوە تا خۆی بگۆڕێت و هات خوا حافیزی بکات:

بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە دەمەوێت جارێکی تریش چاوم پێتان بکەوێتەوە، جارێک وەرە بۆ لامان و سەردانێکمان بکە، ئەگەر مشکیلەیەکشتان هەبوو ئەوا دەبێت ئاگادارم بکەیت، دوای ئەو قسانە ئەفسەرەکە گوندەکەی بەجێهێشت.

مانگێک دواتر، لە ماڵی سەید حوسێن کە خەفەت دایگرتبوو و لە ناخەوە بریندار بوو، سەرکردەکانی عەشیرەتی کوریشخان کۆبوونەوەیەکیان کرد، لەسەر چەند شتێک پرسیاریان لە سەید حوسێن کرد. ئەویش بە بێزارییەوە وەڵامی دانەوە:

- تکاو ڕجای دنیام لێ کردن کە چەکەکانتان تەسلیم مەکەن، بەڵام ئێوە ئەوەی خۆتان ویستان کردتان. بەبێ ئەوەی کەمێک خۆتان ماندوو بکەن، رازی بوون بەوەی خەڵکانێکی دیکە بڕیارتان بۆ بدات. ئێستاش بە دەستی بەتاڵەوە دەبێت ڕووبەڕووی ناخۆشیەکان ببینەوە. خۆ ئەگەر سوپا لە بەینیشمان نەبات، ئەوا من لە خۆم دەپرسم چۆن ڕوومان بێت لەبەردەم عەشیرەتەکانی دیکەدا چاو هەڵبێنین! وەکو بیستوومە دەمامان و بەختیاریەکان بەرهەڵستییەکی قارەمانانەیان کردووە، ئەگەر بشمرن وەکو پیاو دەمرن، بەڵام ئەگەر ئێمە بمرین، مردنێکی بێ قیمەت دەمرین وەکو ترسنۆکێک دەمرین. خۆ ئەگەر بژین ئەوا ڕووبەڕووی نیگای خەڵک دەبینەوە، ئایا لە ڕوومان دێت چاو هەڵبێنین؟ من ترسی ئەوەم لێنیشتووە، چارەنووس و ڕاکردنمان لە هی ئەرمەنییەکان خراپتر بێت.

یەکێک لە سەرکردە دیارەکانی عەشیرەتەکە پێشنیارێکی بۆ سەید حوسێن کرد:

- وەکو بیستوومانە، سەرۆک عەشیرەتەکان دەگرن، ئایا باشتر نییە کە تۆ بۆ ماوەیەک خۆت ون بکەیت؟ ئەوەی کە پەیوەندی بە چارەنووسی ئێمەشەوە هەیە، جارێ

ڕوون نییە بۆمان، باشترە چاوەڕێ بکەین بزانین چی دەبێت.

کاتێک سەید حوسێن گوێی لەو پێشنیارە منداڵانەیە بوو هەڵیدایە:

- هەر لە ئێستاوە ڕوون و ئاشکرایە کە چی چاوەڕێمان دەکات! هێشتا ئێمە هەناسەمان لەبەر نەبڕاوە، بەڵام ئەوەشتان لە بیر نەچێت ئێمە لە ژێر پۆستاڵی سەربازەکانداین و چاوەڕوانی شتی باش مەکەن. بۆنی سوپا و خائینان دێت. مەبەستتان لەوە چییە کە خۆم ون بکەم و عەشرەتەکەم بەجێبهێڵم؟ من هەتا ئێستا لەگەڵ ئەواندا ژیاوم، ئەگەر ئەوان تێکبشکێن و تەفروتوونا ببن، ئەو کاتە ژیان بۆ من چ مانایەکی دەبێت؟ ئەگەر ئێوە چەکەکانتان دانەنایە ئەوا دەمانتوانی لە نێو دۆڵی عەلی و چیایی زارگۆڤیتدا خۆمان بپارێزین، وەکو پیاو بەرگری بکەین.، بەڵام ئێوە ئەو ڕێگایەتان هەڵنەبژارد. ئەو کاتەی چەکەکانتان تەسلیم کرد، بە دەستی خۆتان گۆڕتان بۆ خۆتان هەڵکەند. لەوە دڵنیابن، من لە مردن ناترسم، ڕەنگە مردن زۆر باشتربێت لەو ژیانەی ئێمە. لە ژیانمدا ڕۆژێک لە ڕۆژان بیرم لەوە نەکردۆتەوە وەک کۆیلە بژیم، بە دەستی کەلەپچەکراوەوە بمرم و نەتوانم دیفاع لە خۆم بکەم...

سەید حوسێن قوڕگی گیراو بێدەنگ بوو.

یەکێکی دیکە لە سەرکردەکانی عەشیرەت، پێیوابوو ڕەوشەکە یەکجار وا خراپیش نییە، سوپای تورکیا هێرش ناکاتە سەر ئەوانەی کە پەیوەندیان بە بەرهەڵستکارانەوە

نەکردووە. ئەم قسە منداڵانانە وای لە سەید حوسێن کرد کە بیر لە وەڵامدانەوەی ئەو پیاوانە بکاتەوە کە کەوتوونەتە سەر ڕێگایەکی خەتەر:

- تۆ بە تەواوەتی لە ڕێگای ئاشتیانە و هەڵسووکەوتی سوپا تێنەگەیشتووی، ئەوان بۆ کاتێکی گونجاو دەگەڕێن تا بێنە سەرمان. هەتاوەکو ئەو کاتەی سەید ڕەزایان دەستگیر نەکردووە، سوپا بە ئارامی هەڵسوکەوت دەکات، تا ئەو کاتەش ئەوان نایەنەوێت ئێوە بترسێن، نەوەک پەنا بۆ چیاکان ببەن. بەڵام هەر کە سەید ڕەزایان دەستگیر کرد، دەست دەکەن بە هەڵواسینی خەڵک لە سەرکردەوە بگرە هەتا خەڵکی ئاسایی. پاشان یەک چرکە دوو دڵی ناکەن بۆ کۆتایی هێنان بەو پرۆسەیەی دەستیان پێکردووە.

لە پڕێکدا سەید حوسێن دەموچاوی شڵەژا:

- ئەوە ماوەیەکە من هیچ شتێکم لە سەید ڕەزا نەبیستووە. ئەگەر ئەو لە ناڕەحەتیدا نەبوایە بێگومان پەیوەندی پێوە دەکردم. دەتوانن یەکێک لە خۆتان بنێرن بۆ لای ئاغا شان و هەواڵێکی بپرسن و بزانن پێویستی بە هیچ نییە! هەروەها پێی بڵێن ئێمە چی دیکە دەستمان ئاواڵا نییە چونکە سوپا گەیشتۆتە ناوچەکانی ئێمە. پاشان ئەو کەسە خەبەرەکەمان بۆ بهێنێتەوە کە ئاخۆ چی ڕوویداوە.

... کاتێک ئێما شەل گوێی لە قسەکانی کێکە کالی بوو، خەیاڵ بردییەوە، ئەو ڕۆژانەی بە بیر خۆی هێنایەوە، سەید حوسێنی بیر کەوتەوە کە لە خەڵکە ڕەسەنەکەی گالبووسان بوو. بیری کەوتەوە کە باوکی ئەسپەکەی بە داربەڕووە گەورەکەی بەر ماڵەکەیانەوە بەستەوە و دایکشی

خەریکی لێنانی خواردنێکی بە ناوبانگی ئەو دەڤەرە بوو کە پێیان دەگوت (زەرڤێت)، هەروەها یەکێک لە براژنەکانی خەریکی پاککردنی پیڤاز و ئەوی دیکەیشیان خەریکی ڕۆن قرچاندن بوو. لە پڕێکدا گوێیان لە دەنگێک بوو، هەموو ڕایان کردە دەرەوە. ئەو دەنگە دەنگی ژنێک بوو کە لە خانووەکەی حوسێن بارییەوە هاتە دەرەوە. ئەوە بوو لە ڕووبارەکە(چەمەکە) پەڕینەوە، دەگەنە ئەو بەرەوە سەید حوسێن لە (تەچکە) ژنەکەی حوسێن باریس دەپرسێت:

- تەچکە، تەچکە، بووکەکەم! ئەوە ئەو دادو بێدادەت لە چییە؟ چی ڕوویداوە؟ تەچکە، پووری ئاغا شان بوو، هەواڵی بیستبوو کە ئاغا شانینان سەربڕیوە. بە خەم و پەژارەوە قژیی خۆی دەرنییەوە و پاشان دەستی بە لاواندنەوەی کرد:

"ئاخ، پاشای من، بازی من!

ئاخ، قارەمان، شاهێنی من!

تۆ ئاغای ئاغاکان بوویت،

تۆ مەشخەڵی هەموو دێرسیم بوویت،

تۆ خەوی ناخۆشی دوژمنان و

قەڵای سەختی عەشیرەتەکان بووی.

ئەوان لە خەودا زەفەریان پێ بردیت و

مامیشتیان کوشت کە میوانی تۆ بوو.

پیاوەکانت خیانەتیان لێکردیت و

سەریان بڕیت و بردیان بۆ پاشای تورکان".

سەید حوسێن نەیتوانی بەر بە فرمێسکەکانی بگرێت و دەستی تەچکەی گرت و لەگەڵ دراوسێکاندا چوونە ژوورەوە. سەید حوسێن کە ئەو خەبەرە زۆر کاری تێکردبوو، لە سەر دۆشەکێک گرمۆڵە بوو، لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد:

- ئای چ کارەساتێکە! ئاخ خیانەتکار و تۆبەکارە ترسنۆکەکان، چ پلانێکتان داناوە، ئێوە سەری ئاغا شانی قارەمانی چیاکانتان بڕی؟ دەک بەر نەفرەتی هەموو دنیا کەون! لاشەکانتان بۆ هەتا هەتایە لە نێو ئاگری دۆزەخدا بسووتێت! خوا بە نەحلەتان بکات! دەستەکانتان هێزی تێدا نەمێنێت. ئاخ دێرسیم لەوەتەی تۆ هەیت ڕووداوی وات بەخۆتەوە نەبینیوە. وەکو ئەوە وایە شاخەکانمان بە دەردی کەربەلا چووبن. ئاغا شان سەری بڕدراوە و بردویانە بۆ پاشای تورکان!

ئۆی خوای گەورە، ئێمە لەکاتی جەژنی ئاهەنگی شەمێدا، قوربانیمان بۆ تۆ پێشکەش کرد، ئایا ئێمە شایەنی ئەو هەموو چەوساندنەوەیەین؟

سەید حوسێن زۆر ناڕەحەت بوو، بەلام بۆ ئەوەی دڵخۆشی تەچکە بداتەوە ڕووی تێکرد و وتی:

- مەگری بووکی خۆم! خوا سەبووری هەموو لایەکمان بدات. خیانەت و ترسنۆکی شتێکی سروشتین، ئەو دوو شتە هۆکارن بۆ ترسەکەمان. من دەترسم چەندین سەری تریش ببڕدرێن! ئێما، چاوی لێبوو کە سەید حوسێن هەستایە سەر پێ و لە ماڵەکە هاتە دەرەوە. دوای ئەوەی لە چەمەکە پەڕییەوە و ئەسپەکەی کردەوە...

ئێما لەو بیرکردنەوە قوڵانەدا بوو کە بە هۆش خۆی هاتەوە و سەیری کرد ئەوە کێکە کالی بەردەوامە لەسەر گێڕانەوەکەی:

کاتێک سەید حوسێن لە گالبووسان گەڕایەوە، سەیری کرد کە لە ماڵەکەی خۆیدا چاوەڕێی دەکەن. خەم و پەژارەیەکی زۆر دەم و چاوی کێکۆی داگرتبوو. سەید حوسێن هەواڵی تەندروستی پرسی. ئەویش وەڵامی دایەوە کە رەوشەکە باش نییە، هەر ئێستا ئەو هەواڵەی بیستووە:

- سەید حوسێن، خەبەری ناخۆش دەم بە دەم بڵاوبوونەتەوە، وەکو دەڵێن برازاکەی سەید ڕەزا، رێبەری کۆپ، لەگەڵ برازاکەی دیکەیدا، زەینۆل، لەگەڵ عەشیرەتی عەباسان بە دژی مامیان یەکیانگرتووە و چوونەتە پاڵ دەوڵەتی تورک، سەید ڕەزا بە تەنیا ماوەتەوە، ئێستا لەگەڵ خێزانەکەی بەرەو شوێنێکی نادیار ڕۆیشتوون. هەروەها باسی ئەوە دەکرێت کە زەینۆل و ڕێبەری کۆپ و پیاوەکانیان لە نێو ئەشکەوتێکدا عەلی شێر ئەفەندی و ژنەکەی زەریفە خاتوونیان کوشتووە، سەری براوی عەلی شێر ئەفەندیان لەگەڵ خۆیان بردووە.

سەید حوسێن دۆش داما:

- ئاخ، چ کارەساتێکە! زۆردەستان، هێشتا تینوێتیان لە خوێن خواردنەوە نەشکاوە. ئاخر چۆن ئەوان توانیویانە پیاوێکی وا ئاقڵ و زانا و خوێندەوار بکوژن؟ من دەترسم سەید ڕەزا ئەو پیرە بەستەزمانەش بە هەمان دەرد بچێت!

کێکۆ ئامۆژگاری سەید حوسێنی کرد بڕوات لە نێو دارستانەکاندا خۆی بشارێتەوە، بەڵام سەید ڕەفزی کردبوو.

چونکە ئەو نەیدەویست خزم و کەسوکارەکەی بەجێبهێڵێ. بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە لەگەڵ کێکۆ چوون بۆ گوندی پاخێ هاڤکی و ئەو شەوەیان لە وێ بەسەر برد. بۆ بەیانی خەبەری ئەوەیان بیست کە سەربازەکان خەڵکی سەر بە عەشیرەتەکەی ئەوانیان ڕشبگیر کردووە، بە زۆر داربەڕوو و دار چنارەکانیان پێ دەبڕنەوە و دەیانهاوێنە نێو ڕووباری مونزوورەوە، ئەوەی ئاوی رووبارەکە دارەکان لەگەڵ خۆی ڕاپێچ دەکات بەرەو گوندی مامکی، لەوێ سەربازەکان دارەکان دەگرنەوە بۆ ئەوەی پردێکی پێ دروست بکەن.

سەید حوسێن و پیاوەکانی سواری ئەسپەکانیان بوون بەرەو کەناری رووباری مونزوور کەوتنە ڕێ. لەوێ بە چاوی خۆیان بینیان کە چۆن ئاوەکە دارەکان لەگەڵ خۆیا دەبات، سەربازەکانیش وەکو کۆیلە مامەڵە لەگەڵ خەڵکەکە دەکەن. چارەنووسی ئەو خەڵکە وەکو هی ئەو دارانە وابوو کە دەیانبڕینەوە و هەڵیاندەدانە نێو ئاوەکەوە، وەکو دەڵێن سەربازەکان چواردەوری سەید حوسێن و پیاوەکانی دەگرن و دەیانهێنن بۆ گوندی مامکی. حەسەن باشتر ئاگاداری ئەو ڕووداوەیە، بۆیە داوای لێدەکەم ئەو درێژە بە گێرانەوەکە بدات و بۆمان باس بکات.

## ٣

مامە حەسەنم نەیدەویست خۆی لەقەرەی گێرانەوەی ئەو ڕووداوە دراماتیکیانە بدات، تەنانەت بۆ ئێمەش، بەڵام ئەو ئێوارەیە کێکۆ کاڵی زۆری لێ کرد، بیرێکی لێکردەوە و ناوچاوانی گرژ کرد، بەڕوونی نارەحەتی پێوە دیار بوو، بەڵام دیسانیش بڕیاری دا قسەمان بۆ بکات. ئەوەی کە ئەو بۆی گێڕاینەوە وەکو برینێک وایە لەسەر دڵم:

هەواڵی گرتنی سەید حوسێن، وەکو ئەوە وابوو تەشتێک ئاوی ساردم پێدا بکەن. هەستام چووم ئەو تفەنگەی کە لە نێو جەنگەڵەکەدا شاردبوومەوە دەرمهێنا، داوام لە پێنج لە هاورێکانم کرد کە خۆیان ئامادە بکەن تا لە کاتێکی گونجاودا دەستیان لێبکەینەوە. کاتێک خەبەری ئەوەمزانی سەید حوسێنیان بردووە بۆ گوندەکەی خۆیان چاڵکارین، هاورێکانمم لە سەر ڕێگاکەی مامکی لە نێو تاشەبەردەکاندا دامەزراند و خۆشم چووم بۆ ناو ئاوایی تا بزانم چ باسە. پیاوەکان زانیبوویان سەید حوسێن دەستگیر کراوە، هەر بۆیە لەسەر ڕێگاکە چاوەڕوانییان دەکرد، ژنەکانیش شین و ڕۆڕۆیان بوو. گەنجەکان لە پەنا دیواری خانووەکاندا

وەستابوون، بە حەپەساوییەوە لە یەکتریان دەڕوانی. لە ناوەڕاستی دێکەدا خەڵک هەموو لە دەورم کۆبوونەوە، دەیانوسیت لە ڕاست و دروستی هەواڵەکە دڵنیا بن. بە بەردەوامی ژنەکان دەگریان، کەس نەیدەزانی چی بکات. پاش تاوێک سەربازەکان بە سواری لەگەڵ سەید حوسێن پەیدابوون. هەموو بەرەو دەروازەی گوندەکە ڕۆیشتین تا پێشوازی لێبکەین. بەلاماندا ڕەت بوون و ئێمەش دوایان کەوتین. لە بەردەمماڵەکەی خۆیاندا سەید حوسێن دابەزی و لەگەڵ ئەفسەرێک و دوو سەربازدا چوونە ژوورەوە، پاش کەمێک هاتنەوە دەرەوە، سەید حوسێن پاکەتێکی بچکۆلەی بە دەستەوە بوو، کاتێک ویستی سواری ئەسپەکەی خۆی بێت، ئەفسەرەکە ئیشارەتی بۆ کرد کە سواری بارگیرێک بێت، بۆ خۆشی ئەسپەکەی سەید حوسێنی گرت و خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکە، ویستی ئەسپەکە بۆ پێشەوە هەنگاو بنێت، بەلام ئەسپەکە ملی نەدا، مانی لە ڕۆیشتن گرت و دەیپرماند، پاشان هەڵیخستەوە ئەو سوارە بێگانەیەی لە سەر زینەکەی هەڵدایە خوارەوە. جارێکی دیکە ئەفسەرەکە هەوڵی دا سواری ئەسپەکە بێتەوە، بەلام ئەو دەستی بە حیلاندن و جووتە وەشاندن کرد، بە دەوریاند دەخولایەوە و کەس نەیدەوێرا بچێت بە لایدا. سەید حوسێن دەستی کرد بە پێکەنین بە ئەفسەرە فاشیلەکە، پاشان نیگایەکی خۆشەویستانەی ئاراستەی ئەسپەکەی کرد، ڕووی کردە وەرگێڕەکە و بە ئارامی و لە سەرخۆییەوە پێیگوت؛

- بە کاکی ئەفسەر بڵێ با بەخۆڕای خۆی ماندوو نەکات! ئەو ئەسپە جگە لە من نایەڵێت کەس قاچی باوێتەوە سەر پشتی.

وەرگێڕەکە بۆ ئەفسەرەکەی ڕوونکردەوە کە واقی لەو ئەسپە ئینکارە ورمابوو، پاشان ئەفسەرەکە ئیشارەتی بۆ سەربازێک کرد، کاروانەکە دیسان کەوتەوە ڕێ. پیا و ژن ، منداڵ و پیر هەموو شوێنیان کەوتن و جار بە جارێک خۆیان تێکەڵ بە سەربازەکان دەکرد. بە سەر ئەو تەپۆڵکەیەی پشت ئاواییدا سەرکەوتن و گەیشتنە سەر بەرزاییەکەی پیرگرد.

هەروەک خۆشتان دەزانن ئەو بەرزاییە تەقریبەن کیلۆمەتر و نیوێک درێژ بۆتەوە، پێنج سەد مەترێکیش پانییەکەیەتی، چواردەوەری بە پێنج گوندی بچکۆلە گیراوە. خەبەری گرتنی سەید حوسێن بڵاوببووە و گوندنشینەکان هەموو هاتبوونە سەر ڕێگاکان و پەرژینێکیان دروست کردبوو و وەستابوون.

کاتێک سەید حوسێن لە بەرزاییەکەوە دەرکەوت و ئەو هەموو خەڵکەی بینی، لە ناخی خۆیدا دەکوڵا. وەکو ئەوە وابوو کە بیەوێت شتێک بڵێت.

لە ناکاو ئەسپەکەی وەستا، وەکو دارێک لە جێگای خۆیدا چەقی، سەربازەکان هەرچیەکیان دەکرد نەیاندەتوانی بیجوڵێنن. سەید حوسێن و ئەفسەرەکە وەستان، ئەفسەرەکە تەماشای ئەسپەکەی دەکرد. ئێمەش خۆمان تێکەڵ بە سەربازەکان کردبوو. یەکێک لە سەربازەکان بە هەموو هێزی خۆی ڕەشوەی ئەسپەکەی گرتبوو و ڕایدەکێشا، بەڵام ئەسپەکە هەر سەیری خاوەنەکەی دەکرد. سەید حوسێن دابەزی و چوو بۆ لای ئەسپەکەی، دەستی بە پشتیدا دەهێنا بۆئەوەی ئارامی بکاتەوە، پاشان ڕووی کردە وەرگێڕەکە و پێی گوت:

- تکاتان لێدەکەم! بە ئەفسەرەکە بڵی کە ڕێگام بدات خۆم سواری ئەسپەکەی خۆم ببم، سەیری کەن ئەوەتا دەگری

و دەستی بۆ ئەسپەکە ڕاکێشا کە چاوی پڕ ببوو لە فرمێسک. ئێمە هەموو سەیرمان دەکرد. ڕاستییەکەی ئەوەبوو، سەید موبالەغەی نەدەکرد بەڵکو بەراستی ئەسپەکە دەگریا.

ئەفسەرەکە بۆ چرکەساتێک بیری کردەوە و گوتی:

- شتی وا نییە! ئەوە پێچەوانەی ئەو فەرمانەیە کە پێمان دراوە، ئەوەی گوت و بەسەر نیشانەی نەخێری نیشان دا.

سەید حوسێن ئینکاری کرد:

- باشە، با وەکو ئەوەی ئێوە دەڵێن وا بێت، من سواری بارگیرەکە دەبمەوە، بەڵام هەر هیچ نە بێت ڕێگام بدەن کە ڕەشوەکەی بەدەست خۆمەوە بێت، دەنا ئێوە ناتوانن وای لێبکەن بڕوات.

ئەفسەرەکە ڕازی نەبوو:

باشە، با لە تەنیشت خۆتەوە بڕوات، بەڵام دەبێت سەربازێک بیگرێت، سەید حوسێن سواری هێسترەکە بووەوە، چوو بۆ لای ئەسپەکەی، ڕەشوەکەی دایە دەست سەربازێک و کەوتنە ڕێگا. چەند جارێک ئەسپەکە حیلاندی و دەم و لمۆزی خۆی لە ئەژنۆی خاوەنەکەی هەڵدەسوو، بە ئاشکرا دیاربوو کە داوای لە خاوەنەکەی دەکرد ڕابکات. ئێستاشی لەگەڵدا بێت، من هێشتا لە خەڵک دەپرسم تۆ بڵێی سەید حوسێنیش هەروا لە مەبەستی ئەسپەکەی گەیشتبێت؟

کاتێک لە گوندەکانی پۆلۆسوور و گوندور دەرکەوتین، بە دەنگی گریان و هاواری ژنان پێشوازیمان لێکرا، دەنگەکانیان تێکەڵ بە دەنگی ئێمە دەبوو. سەید حوسێن سەیرێکی

چواردەوری خۆی کرد: تێناگەم ئێوە بۆچی دەگرین! ئایا دەتانەوێت بەو گریانە چیتان دەستبکەوێت؟ ئەو گریان و هاوارە تەنها دڵی من دەسوتێنێت. بەسە، چیتر مەگرین. ئەمەی بە شانازییەوە گوت.

کەمێک لەولا ترەوە لە سەر گۆڕستانەکە سەید حوسێن جارێکی دیکە وەستایەوە و ڕووی دەمی کردە وەرگێڕەکە:

- دایک و باوکم لێرەدا نێژراون. ئەگەر کاک ئەفسەر ڕێگام بدات دەمەوێت تاوێک لایان بم.

وەرگێڕەکە داخوازییەکەی سەید حوسێنی بە ئەفسەرەکە گوت، ئەویش فەرمانی بە سەربازەکان دا کە چوار دەوری گۆڕستانەکە بگرن و بە سەید حوسێنی گوت:

- باشە، بڕۆ!

لەو کاتەدا فرسەتم هێناو چووم ڕەشەوەی هێسترەکەیم گرت تا دابەزێت، کاتێک لەگەڵیدا بەرەو گۆڕەکان ڕۆیشتین بە چرپە پێم گوت:

- مامە حوسێن، لە پێشمانەوە پێنج چەکدار لە نێو تاشە بەردەکاندا خۆیان حەشارداوە و ئامادەن، دەمەوێت هەرچی زووترە خۆم بگەیەنمە لایان. کاتێک کە ئێوە گەیشتن، تەقە لە سەربازەکان دەکەین و تۆش فرسەت بهێنە و خۆت بە نێو دارستانەکەدا بکە.

سەید لەنێو چاوەکانمی ڕوانی و بە هێواشی گوتی:

- ئاگاتان لە خۆتان بێت! نەکەن غەڵەتی وا بکەن!

یەکەم ئێوە بە شەش تفەنگەوە هیچتان پێ ناکرێت. دووەم من هەرگیز ناتوانم بەم هێسترەی داویانە پێم خۆم

ڕزگار بکەم. سێیەم وەکو ئەوە وایە ئێمە بە دەستی خۆمان ڕێگایان بۆ بکەینەوە بۆ ئەو کارەی کە ئەوان دەیانەوێت بیکەن، هەمووتان بە ژن و منداڵەوە دەکوژن. گەیشتینە سەر گۆڕەکان. سەید حوسێن لەسەر گۆڕەکەی موترۆ باس باوکی سەید باکیل بە چۆکدا هات، ئاخر وەکو باوکی خۆی چاوی لێ دەکرد. ئەو زۆر شتی لێوە فێرببوو و بیرەوەریەکی زۆری لا بەجێهێشتبوو. دوعای بۆ کرد، لە بەردەمی گۆڕی دۆی مورتەسوور چەمایەوە و بەردەکانی ماچ کرد. گۆڕی باوکیشی هەر لەوێ بوو، باوکی زۆر بە گەنجیتی بەجێی هێشتبوو. لە بەردەم گۆڕەکەیدا بە چۆکدا هات و دەستی بە گریان کرد. ویستی ڕووخساری دایکی بەبیر خۆی بهێنێتەوە کە دوو ساڵ دوای مردنی باوکی بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردبوو. تۆزێک گڵی کردە ناو دەستەسڕەکەیەوە و پاشان چوو لە ناوەڕاستی گۆڕستانەکدا وەستا، تا لە گوند و چیا و بەرزاییەکان بڕوانێت کە بە چوار دەوریدا بڵاوببونەوە.

ئەفسەرەکە ئارامی لێ هەڵگیرابوو ڕووی کردە وەرگێڕەکە و گوتی:

- پێی بڵێ ئێمە کاتێکی زۆرمان بە دەستەوە نییە، با پەلە بکات.

سەید حوسێن وەڵامی دایەوە: ئارام بە.

پاشان دەستی بۆ گوندە بچکۆلەکان ڕاکێشا:

سەیرکە لەو لایەوە ئەوە گوندی پۆلۆ سوورە، ئەوەشیان گوندی گوندورەیە لە پاڵ ئەوانیشدا گومەڕەش و کەمرە بەلد و دێرکە. هەموو ئەو خەڵکەی کە لەو گوندانەدا دەژین

خزم و کەسووکار و هاوڕێی منن. زۆر جار لە گەڵیاندا قسەوباسم کردووە و پاروە نانێکمان بە یەکەوە خواردووە. من هەموو ژیانی خۆم لە نێو ئەو چیا بەرزانەدا بەسەر بردووە، لە ژیانمدا هیچ کاتێک ڕێگای خوام بەرنەداوە، خۆم لە هەژاران بە گەورەتر نەزانیوە، لە ژیانمدا بۆ هیچ خوێنمژێک نەچەماومەتەوە، کەسم نەچەوساندۆتەوە، زۆر دەستیم بەسەر کەسدا نەکردووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە من سەرۆک عەشیرەت بووم، دەسەڵاتی ئەوەشم هەبووە و دەمتوانی شتی وا بکەم. لەم دنیایەدا هیچ کاتێک دوای سەروەت و سامان نەکەوتووم. وەکو خۆیشت دەیبینی ئەوە لە بەر خاتری منە ئەو پیاوانە کۆبوونەتەوە و ژنەکانیشیان دەگرین. ئەوان باش دەزانن من جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە بۆ نێویان، ئەو دادپەروەرییەی من بە دوایدا وێڵ بووم و دەمویست لەم ناوچانەدا بەرقەرار بێت، پیادە ناکرێن. ئیتر لە ئێستاوە گورگە بۆرەکان دەست بەسەر ئەم دەشتاییانەدا دەگرن، ترسنۆکەکانیش ناچار دەکرێن کڕنووشیان بۆ بەرن. ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەو خەڵکە دەگرین. ئەوەی وەکو خواحافیزییەک گوت، بە خۆیی و پاکەتەکەی دەستییەوە لێم هاتە پێشەوە، باوەشی پێداکردم و چەند جارێک ماچی کردم و بە چرپە پێی گوتم:

- حەسەنی ئازیز، من زۆر نیگەرانم. ئەم جانەوەرانە هەموان قەتڵ و عام دەکەن. ئاگاداری خۆتان بن! کاتێک هەستتان بە مەترسی کرد، ڕوو لە چیاکان بکەن. بە هەمووان بڵێن خۆشم دەوێن، پێیان بڵێن من دەستەڵاتم بەسەر کەسدا نەماوە، با گەردنم ئازاد بکەن!

پاکەتەکەی دایە دەستم:

با ئەمە یادگارییەک بێت لای تۆ، ئەمەی گوت بە خێرای سواری هێسترەکە بوو، لە چاوان ونبوو. کاروانەکە ڕۆیشت و تا دەهات دوور دەکەتنەوە.

هەتا لێمانەوە دیاربوون چاوم لە سەریان نەترووکاند، هاوبەشی خەم و خەفەتی ژن و منداڵەکانم دەکرد. کاتێک هاتمەوە سەرخۆم، پاکەتەکەم وەرچەرخاندو هاوارم کرد:

- ئەمە ترسنۆکییە، ئەمە خیانەتە! خواماڵی ترسنۆکەکان بەسەریاندا بروخێنێت و ئاگردانیان بێ ئاگر کات!

وەکو سەرگەردان لەو ناوەدا وەستابوین، نەماندەزانی چی بکەین و ڕوو لە کوێ بکەین. ئاخریەکەی گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە.

## ٤

زۆرم حەز دەکرد بزانم دوای ئەوەی سەید حوسێنیان بردبوو بۆ ئەلعەزیز، چی بەسەرهات؟ بەڵام ئەو ئێوارەیە گێڕانەوەکەی مامە حوسێن بە شێوەیەکی وا کاری کردبووە سەر گوێگرەکان، ناچاربوو کۆتایی بە گێڕانەوەکەی بهێنێت. جگەلەوەش شەو درەنگی کردبوو، کاتی ئەوە هاتبوو جێگا بۆ میوانەکان ڕابخەین، ئێمە ژنەکان لە چێشتخانەکدا خەوتین.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە زانیم، پیاوێکی خەڵکی چاڵکارین گوندەکەی سەید حوسێن هەیە، ناوی عەلی بوو بە باشی بەردەوامی ڕووداوەکەی دەزانی، بۆیە بڕیارمدا بچم سەردانی بکەم. ئێوارەیەکیان هەستام چووم بۆ لای و پرسیارم لێکرد ئاخۆ دەکرێت باسی چارەنووسی سەید حوسێنم بۆ بکات کە ئەو بۆخۆی زۆری خۆشدەویست؟ بەبێ هیچ دوو دڵییەک، عەلی بەڵێنی دا، هەموویم بۆ بگێڕێتەوە:

بیست ڕۆژ دوای ئەوەی سەید حوسێنیان برد، هەستام چەند شوشە هەنگوین و ڕۆنێکم پێچایەوە، جلم بۆ سەید حوسێن بە دووریندا و خستمە ناو گوێنییەکی بچکۆلەوە و سواری هێسترەکەم بووم بەرەو ئەلعەزیز.

ڕاستییەکەی ئەوەیە سەفەرکردن لەو ڕۆژگارەدا خەتەرناک بوو، سەربازەکان بە بەهانەی جۆراو جۆرەوە ڕێگایان لە خەڵک دەگرت سەفەر بکەن. ئەو ڕۆژە زۆرم هەوڵدا سەربازەکان نەمبینن، کە گەیشتمە ئەلعەزیز یەکسەر چووم بۆ دوکانەکەی حوسێنی کوڕی خەجێ کە خەڵکی دێرسیم بوو، بۆم ڕوونکردەوە کە بە چ مەبەستێک هاتووم، ئەویش ئارامی کردمەوە:

- من زوو زوو سەردانی سەید حوسێن دەکەم، ئێستا لە هۆتێلێکی کۆن دایان ناوە و سەرباز پاسەوانی دەکەن. بەڵام جارێکە تۆ لە ڕێگایەکی دوورەوە هاتوویت، وەکو گورگێک برسیتە، تۆزێک نانی نانەوا لەگەڵ کەمێک زەیتووندا بخۆ تا کەمێک سکت تێر دەبێت. فەرمووی لێکردم تا دانیشم و نان و زەیتوون و پیاڵەیەک چای لەسەر مێزێک بۆ دانام. ئەوەی کە ئەو پێی دەگوت زەیتوون لە ڕاستیدا شتگەلێکی وەک رازیانە وابوون، هەتا بڵێی سوێر و هەروەها ڕۆناوی بوون، چایەکەشی تا بڵێی شیرین بوو، لە چای لای خۆمان دەچوو، کەمێکم لێخوارد و پاشان گوێنیە بچکۆلەکەی لەگەڵ خۆمدا هێنابووم هەڵمگرت و دوو بە دوو ڕۆیشتین.

زۆر ڕۆیشتین تا گەیشتینە بەردەم خانوویەکی کۆن کە سەرباز چاودێریان دەکرد. کوڕەکەی خەجێ تورکییەکی تا ڕادەیەک باشی دەزانی، لەگەڵ سەربازەکاندا کەوتە معامەلە و پاش ئەوەی پشکنینیان، کردینیانە ژوورەوە.

سەید حوسێن لە ناوەڕاستی ژوورێکی گەورە لەسەر کورسییەکی دار دانیشتبوو، هەر کە ئێمەی بینی هەستایە

سەرپێ و بەرەو ڕوومان هات. ئەم لاو لای منی ماچ کرد و تەوقەی لەگەڵ حوسێندا کرد، بە دەنگێکی دڵخۆشکەرانەوە گوتی:

- عەلی گیان، ئەوە خۆت گەیاندە ئێرە.

وەڵامم دایەوە:

- ئێمە خەمی تۆمانە، سەیدی من. هاتووم بزانم حاڵ و ئەحواڵت چۆنە و تۆزێک شتیشم بۆ هێناوی.

سوپاسی کردم:

باش بوو کە هاتوویت. زۆر نیگەرانم و بەشەو خەو ناچێتە نێو چاوەکانمەوە، باسی خۆتانم بۆ بکە! ئەوە تەنها شتێکە کە من پێویستمە! باقی شتەکان حوسێنی خەجێ جێبەجێیان دەکات.

دەستی بۆ دوو کورسی راکێشاو کورسیەکەی خۆیشی هێنایە لایانەوە و سەیری نێو چاومی دەکرد. لە خۆم پرسی ئایا باسی هەموو شتێکی بۆ بکەم یان نا، بۆ ساتێک کەوتمە دوو دڵییەوە. سەید لەوە تێگەیشت کە ڕەوشەکە خراپە:

- دەزانم خەبەری خۆشت پێ نییە، بەڵام چی ڕوویداوە هەموویم بۆ بگێرەرەوە.

هەناسەیەکم هەڵکێشا: خێزانی سەید ڕەزایان کۆکووژ کردووە، کەس ڕزگاری نەبووە تەنها کوڕەکەی و کچەکانی و برازاکەی کە ناوی تەسلیمە، نەبێت.

سەید حوسێن پەژارە دایگرت و دەستەسرەکەی دەرهێنا تا چاوەکانی پێ وشک بکاتەوە، ویستم دڵنەوایی بدەمەوە:

- حەیدەریـەکان، دەمامـەکان و بەختیاریـیـەکان ئازایانـە دەستیان کردۆتـەوە و زەرەرو زیانێکـی زۆریـان بـە سـوپا گەیانـدووە.

کەمێک تێڕاما و پاشان بە چرپە پێی گوتم:

- مـن هـیـچ شـتێکم نییـە بیلێـم. ئێـوە دەبێـت ئـاگاداری ڕووداوەکان بـن، ئـەو دەسـتە ترسنۆکەی کـە خێزانەکـەی سـەید ڕەزای قەتـڵ و عـام کـردووە، ئەگـەر ئـەوان بتوانـن سـەید ڕەزا دەسـتگیر بکـەن و لـە سـێدارەی بـدەن، ئـەوا هەمـووان هەڵدەواسـن و کۆتایـی بـە کارەکانیـان دەهێنـن. مـن نەمتوانـی عەشـیرەتەکەم وا لێبکـەم بـە شـێوەیەکی ئاقڵانـە بجوڵێنـەوە. ئێسـتاش پێیـان بڵـێ بـا بچنـە نێـو چیاکانـەوە، ئەگـەر پێویسـت بێـت بـا لـە کلۆرە دارەکانیشدا بێت خۆیـان بشـارنەوە! ئەمـەی بەوپـەڕی نیگەرانییـەوە گـوت.

سـەید دەیزانـی کـە چاوپێکەوتنەکەمـان کـورت دەبێـت. هەسـتا چـوو بـۆ ژوورەکـەی خـۆی، کـە هاتـەوە پاکەتـە جگـەرە سلقەریەکەی و ئەسـتێ و بـەرد و فانیلـە و عەلاگـە سـپیەکەی و جامانەکـەی خسـتبووە نێـو کیسـەیەکەوە و دایبـە مـن. ئـەم لاو لای ماچکـردم. ئێمـەش وەکـو نیشـاندانی ڕێـز و حورمـەت بـۆ سـەید حوسـێن دەسـتەکانیمان مـاچ کـرد و پێـش ئـەوەی بڕۆیـن ئـەم ئامۆژگاریانـەی کـردم:

پێـش هەمـوو شـتێک زۆر لێـرە مەمێنـەرەوە! سـواری هێسـترەکەت بـەو بگەڕێـرەوە. هـەوڵ بـدە هـەر ئەمـڕۆ بگەیتـە پێرینـگ و پاشـانیش گۆنـی پیلنـک، لـەوێ بـۆ خـەوتن بمێنـەرەوە. بەیانـی لەگـەڵ زەردەپـەڕدا دیسـان بکـەوەرەوە ڕێ.

سەربازەکان هاتن پەلیان گرتین تا بمانبەنە دەرەوە. کە ژوورەکەم بەجێهێشت وەکو ئەوە وابوو بەشێکم لە جەستەی خۆم بەجێهێشتووە. ئەوە دواجار بوو سەید حوسێن بە زیندویەتی ببینم.

مانگێک دوای گەڕانەوەم بۆ گوندەکەی خۆمان خەبەرمان بیست کە لە ناخافڵدا لە کاتی خۆ ئامادەکردن بۆ پەڕینەوە بەسەر پردێکدا بەرەو ئەرزنجان سەید ڕەزایان گرتووە، پاشان دەیبەن بۆ زیندانی ئەلعەزیز، لەوێ لەگەڵ سەید حوسێن بەیەک دەگەنەوە. ئێمە تەنها ئەوەندە ئاگامان لێیانبوو، دوای ئەوە هیچ دەنگوباسێکی دیکەمان نەبیست، چونکە ئەوانیان لە شوێنێکی نادیار زیندانی کردبوو. ماوەیەکی زۆری پێچوو تا زانیمان کە لە دادگاییەکی تایبەتدا حوکمیان دابوون، پاشان لە سێدارەیان دابوون.

بە گوێرەی ئەو قسانەی کە حوسێنی کوڕی خەجێ بۆی گێڕامەوە، ئەتاتورک بەرنامەی دانابوو کە لە نۆڤەمبەری ١٩٣٧ دا سەردانی ئەلعەزیز بکات، پەردە لەسەر کردنەوەی پردی سینگهێشتن لابدات. ئەتاتورک مەترسی ئەوەی لێنیشتبوو بە هاتنی ئەو خۆپیشاندانی دوژمنانە بەرپا بکرێت، بۆیە پێش هاتنی خۆی وەفدێکی رەوانەی ئەوێ کردبوو و "پەیامی ئەوەیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو کە پێش ئەوەی ئەتاتورک بگاتە ئەلعەزیز دەبێت سەید ڕەزاو و سەید حوسێن و فندێک ئاغا لەناو ببردرێن".

هەر ئەو ئێوارەیەی وەفدەکە دەگەنە جێگا، ئەو حاکمەیان لەسەر کار لابردبوو کە سەرپەرشتی داداگاییەکەی دەکرد، جێگرەکەیان خستبووە شوێنی، سینەمایەکیان تەرتیب

کردبوو و کردبوویان بە جێگای مەحکەمە کردن. حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ حەوت پیاوی سەرکردەی خەڵکی دێرسیم بڕیبووەوە، لە گۆڕەپانی "گەزرەی" ئەلعەزیز کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادەیان کردبوو، لە سێدارەیان دابوون. کاتێک بڕیاری لە سێدارەدانەکەیان دەرکردبوو، حوکمدراوەکانیان بە ماشێنێکی سەربازی گواستبووەوە بۆ گۆڕەپانەکە. سەید ڕەزا تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵ بوو، بە گوێرەی قانوون نەیاندەتوانی بەهۆی تەمەنەکەیەوە حوکمەکەی جێبەجێ بکەن. بۆیە تەمەنەکەیان کەمکردبووە بۆ حەفتاو سێ ساڵ. هەر بە هەمان دەلیل کوڕەکەی سەید ڕەزا کە تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو کردبوو بە نۆزدە ساڵ واتە دوو ساڵ تەمەنەکەیان گەورەتر کرد بوو، تا حوکمەکەی جێبەجێ بکەن. واتە بە چەند سەعاتێک هەموو ئەو بەربەستە قانوونیانەیان لابردبوو کە ڕێگریان لە جێبەجێکردنی بڕیاری داگا دەکرد، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن دەستوبرد لە کارەکەدا بکەن. یەکەمجار فێندک ئاغا دەبەنە بەر پەتی سێدارە، بەڵام پەتەکە دەپچرێت بۆیە جارێکی تر هەڵی دەواسنەوە. پاشان گەنجە حەڤدە ساڵەکەیان هێنابوو، بەڵام سەید ڕەزا خۆی خستبووە بەردەمی و نارەزایەتی نیشان دابوو لەوەی کە کوڕەکەی لەبەرچاوی خۆیدا هەڵبواسن و گوتبووی:

- لە پێشدا من لە سێدارە بدەن!

بۆ خۆی چووبووە بەردەمی قەنارەکە و پاڵێکی بەو قەرەجەوە نابوو کە دەبوو کارەکە بکات، بۆیە بە دەستی خۆی پەتەکەی خستبووە گەردنییەوە و بە دەنگێکی بەرز هاواری کردبوو:

- ئێمە کوڕی حوسێن و شەهیدی کەربەلاین! ئێمە بێتاوان و بە ئیمانین. ئەم کۆمەڵکوژیە کردەوەیەکی ستەمکارانەیە. سەید رەزا شەقێک لە تەختەکەی کە لە ژێر پێیدابوو هەڵدەدات.

تا ئێستاش بۆمان ڕوون نەبۆتەوە کە ئاخۆ سەید ڕەزا ڕووی دەمی لە کێ بوو کاتێک ئەو قسانەی کردووە. ئیتر بەو شێوەیە سەید حوسێن و ئەوانی دیکەیشیان لە سێدارە دەدەن.

وەک دەڵێن لاشەکانیان بە ماشێنێکی سەربازی دەگوێزنەوە بۆ شوێنێکی نادیار و بەنزینیان پێدا دەکەن و دەیانسووتێنن.

کاتێک گوێم لە قسەکانی عەلی خەڵکی تچاڵکارین بوو، گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەوانەی کەمێک پێش بەهاری ١٩٣٨ لە سێدارە دران، وایان لێکردم کە بەجددی هەوڵی ئەوە بدەم بە دوای نهێنیەکانی ئەو کارەساتانەی بەسەر گەلەکەماندا هاتووە بکەوم و هەتا دەهات زیاتر عەلاقەم بۆ سەرۆک عەشیرەتەکەمان سەید حوسێن زیاد دەکرد.

نازانم تۆ تا چەند شاعیر (وەلا ئیسا ئیمامیت) لە بیر ماوە. ئەو خەڵکی دێرسیم بوو، شیعرێکی بۆ پیاهەڵدان و پەسندانی سەید حوسێن نووسیبوو کە لەگەڵ ئاوازی شمشاڵدا دەیگووتەوە، هەر کە گوێم لەو شیعرە دەبوو، فرمێسک بە خوڕ بە چاوانمدا دەهاتە خوارەوە. خۆ بۆخۆشت دەزانیت، منیش گۆرانی دەڵێم. هەر کاتێک لەم گوند بۆ گوند بەدوای ڕابردووی خۆمدا وێڵ دەبووم و، چاوم بە لووتکەکانی چیای زارگۆڤیت بکەوتایە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە ئەو شیعرەم دەگوتەوە:

ئەوان سەید حوسێنیان لەگەڵ خۆیان برد!
ئەوان سەیدیان لەگەڵ خۆیان بۆ دەشتی سێگانک برد.
عەشیرەتەکەم داوام لێدەکەن گەردنیان ئازاد بکەم!
خەڵکەکەم پێم دەڵێن بچۆ بۆ لای خوا!
دەڕۆم، دەشزانم کە جارێکی دیکە ناگەڕێمەوە.
ئاخ، ئاخ، ئاخ!
لە ڕاستیدا ناتوانم لە بیر خۆمی بەرمەوە،
ناتوانم لە بیری بکەم کە برا چەند ترسنۆک بوو،
کاتێک سەید حوسێنی بە دەستەوە دا.
کاتێک گەیشتمە شاڵە لوول خواردوەکەی سۆرپیان،
بۆ دواجار ئاوڕێکم دایەوە و
هەموو ڕێگاکانی وڵاتەکەمم بینی.

# ١

تەمەنم گەیشتبوو بە سی ساڵ کەچی هێشتا هەر لەم گوند دەچووم بۆ ئەو گوند. هیچ شتێک نەبوو لەم دونیایەدا بتوانێت ڕێگام لێبگرێت، ئەمە سەرەڕای نارەزایەتی مامم و ئامۆژنم. هەستم بە هیچ ئیحساسێک نەدەکرد لە قاچمدا، ئەژنۆشم هەر لە هەشت ساڵییەوە لە گەورەبوون کەوتبوو. قۆڵیشم بەهەمان شێوە کاتێک دەڕۆیشتم تەکانی دەدا. کە منداڵ بووم تەنها لە دوورەوە سەیری ئەو منداڵانەم دەکرد کە یاریان دەکرد، بە شێوەیەکی گشتی هەمیشە تەنها بووم. ئەوەی ڕاستی بێت کەس لێم تێنەدەگەیشت، بەڵام من گوێم پێ نەدەدا. لە جیاتی ئەوە لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەڕۆیشتم، بە دوای شتێکدا دەگەڕام کە خۆشم نەمدەزانی چییە، تەنها شتێک کە هەستم پێ دەکرد ئەو بۆشاییە بوو کە بە مردنی دایک و باوکم و براکانم و خدری بچکۆلە و سەگەکەمان سێتچۆ، لە دوای خۆیان لە ناخمدا بە جێیان هێشتبوو. ئەوەی کە نەمدەتوانی دەستبەرداری ئەو هاتووچۆیە ببم، پەیوەندی بەو بۆشاییەوە هەبوو کە وەک مۆتەکەیەک سواری سەرم ببوو.

کاتێک ماڵی مامم بەجێدەهێشت و دەچووم بۆ دێیەکی دیکە، سەرەتا هەستم بە سووکبوونی باری سەر شانم نەدەکرد، بەڵام دەبووە هێز و پاڵنەرێک بۆم. کە بە خۆم و خەموخەفەتەکانی سەر شانمەوە ڕووم لە هەرشوێنێک دەکرد، هەستم دەکرد ئەو بۆشاییەی نێو دەروونم تا دەهات گەورەتر دەبوو. ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەهۆی ئەو هاتووچۆیەمەوە قسەوقسەڵۆکیان دەخستە دوام، بیستنی ئەو قسە و قسەڵۆکانە نارەحەتی دەکردم.

ڕۆژێکیان بە ڕێکەوت گوێم لە مامم و ئامۆژنم بوو گفتووگۆیان دەکرد و دەیانگوت: ئێما، گوێمان لێ ناگرێت، هەر خەریکی گەڕانی خۆیەتی. ئێستا ئەو کچێکی عازەبە و کوڕەکانیشمان چیتر منداڵ نین. ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان سکی پڕ بێت ئەوا ڕاستەوخۆ خەڵک گومان لە پیاوەکانی خۆمان دەکەن!

بڕیارمدا بارکەم بۆ نێو شار.

لە تونجەلی(تورک ناوی دەرسیمیان گۆڕیوە بۆ تونجەلی. وەرگێڕی کوردی) خەڵکم دەناسیی و دڵنیابووم لەوەی کە هاوکاریم دەکەن. ڕۆژێکیان مامم و خێزانەکەی بە سەردان ڕۆیشتبوون، فرسەتم هێناو هەندێک کەلوپەلی خۆمم پێچایەوە، هەستام و لێمداوو ڕۆیشتم. چاوەکانم سوور هەڵگەڕابوون، بەبێ ئەوەی ئاوڕێک لە دوای خۆم بدەمەوە، بە دەشتی پیرگردا چوومە خوارەوە، دەمەو نیوەڕۆ بوو گەیشتمە سەر ڕووباری مونزوور، لامدا، دەموچاوم بە ئاوە سارد و سازگارەکەی مونزوور شوشت. پاشان لە خوا و مونزوور بابا پاڕامەوە تا یارمەتیم بدەنە. ڕۆیشتم

تا گەیشتمە کەنارەکانی دیکە، بەبینی یەکەم کەس پرسیاری ماڵی عەلیم لێکرد، کەسێک بوو بە دڵ سەخاوەتی ناسرابوو. ئەویش پێی گوتم، ڕێگای لای گەڕەکی چیایەکە بگرم. بەسەر بەرزاییەکەدا سەرکەوتم، ڕۆیشتم تا گەیشتمە ئەخیر ماڵ.

لەبەر دەرگا، عەلی بە باوەشێکی ئاوالاوە، بەخێرهاتنی کردم و بەبێ هیچ دوو دڵییەک فەرمووی لێکردم. منیش بۆم ڕوونکردەوە کە بە چ مەبەستێک هاتووم. عەلی پیاوێکی فەقیر بەڵام میهرەبان و دڵ سەخی بوو. ژوورێکی لە دەرەوەی حەوشەکەیان پێدام. دەستم بە پاکردنەوەی ژوورەکە کرد، بەڵام ئەوەی پێی بڵێی شتی ناو ماڵ تێیدا نەبوو. نە دۆشەکێک، نە حاجەت تەنانەت سەرینێکیشی تێدا نەبوو. دوای ئەوەی کە زەوییەکەم کراند و جوان پاکم کردەوە، چووم کەمێک گەڕام، داوام لە ناسیاوەکانم کرد یارمەتیم بدەن، خۆشبەختانە دۆشەکێک و هەندێک کەلوپەلم پەیدا کرد. لە ماوەیەکی کورتدا توانیم شوێنێک پەیدا بکەم کە تێیدا بژیم. ژیانی نێو تونجەلی(دێرسیم) هەتا بڵێی لەو ژیانەی من لە گوندەکەمان پێی ئاشنابووم، جیاوازتر بوو، بەشێوەیەک هەر بەراورد نەدەکرا. چونکە تازە هاتبووم کەس نەیدەناسیم، بەڵام زۆری نەبرد بە هۆی قۆل و قاچە ئیفلیجەکەم و جوانییەکەمەوە، سەرنجی خەڵکم بۆ لای خۆم ڕاکێشا. بە ئێواران جار بە جارێک ژنە دراوسێکانم دەهاتن بۆ لام. بە تامەزرۆییەوە پرسیاریان دەربارەی قاچ و قۆلمیان لێدەکردم، ئەمە سەرەڕای دەیان پرسیاری دیکە، منیش تووڕە دەبووم و پێم دەگوتن:

- نابێت مرۆڤ خۆی بە برینەکانەوە بکات!

پاش ماوەیەک لەگەڵ ژیانی نێو شاردا ڕاهاتم. بۆخۆم بە تەنیا دەچووم بۆ بازاڕ و داوای یارمەتیم لە بازرگانەکان دەکرد، ئەوانیش بەو پەڕی موحیبەتەوە ئەوەی بۆ ئەو ڕۆژە پێویستم بوایە دەیاندامێ. ڕۆژێکیان لە کاتی گەڕانەوەدا، پیاوێکی تەمەن مامناوەندی کە لە قاوەخانەیەکدا دانیشتبوو، سەرنجی ڕاکێشام، بە دیقەت تەماشای دەکردم. بەشێوەیەکی وا لە دەست و قاچم ورد دەبووەوە کە شەرمم لە خۆم دەکرد. خەریک بوو هەتا بتوانم بەسەریدا بقیژێنم، بەڵام کە بینیم هەستایەوە و بەرەو ڕووم هات، پەشێمان بوومەوە. ئەو پریاسکەیەیی خواردنەکەم تێکردبوو بە دەستمەوە بوو، کە گەیشتە لام ڕێک لە چاویم ڕوانی و لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر قسەیەکی ناشیرینی لە دەم بێتە دەرەوە، هەتا دەتوانم پیایدا دەکێشم، بەڵام کە زیاتر لێم هاتە پێشەوە بۆم دەرکەوت، مەبەستی خراپە کردن نییە. کە گەیشتە لام بە زمانی تورکی زۆر بە نەرمونیانی قسەی لەگەڵ کردم. بەڵام یەک وشەی لێ تێنەگەیشتم، وەک تۆ خۆشت دەزانی من ئەو زمانە نازانم. بۆیە پرسیاری لە پیاوێکی گەنج کرد کە لە تەنیشتمانەوە ڕەت دەبوو، ئاخۆ دەتوانێت ببێتە وەرگێر لە نێوانماندا؟ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ یەک قسەیان کرد. پیاوە گەنجەکە، چیان گوتبوو هەمووی بۆ باس کردم و گوتی ئەم پیاوە دەڵێت:

- من ناوم ئەنقەر سابوچلۆیە و دکتۆری نەشتەرگەریم، ئێستا لە نەخۆشخانەی گشتی تونجەلی کاردەکەم. ئەمە دووەم جارە تۆ دەبینی. دەبێت ئەوەش بڵێم هەر لەسەرەتاوە ئیفلیجییەکەتم بینی، بۆیە دەمەوێت بزانم ئاخۆ تا ئێستا چوویتە لای دوکتۆر یان نا؟ بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە

ئەگەر خۆت بتەوێت ئەوا بەیانی لە خەستەخانە دەتوانم ببتبینم. منیش لە وەلامدا گوتم من خۆم گوێی پێنادەم، ڕۆیشتم. پاشان بیستم کە دکتۆرەکە بەو خەڵکەی کە لە دەورمان کۆبووبوونەوە گوتبوو:

- هەوڵبدەن ئەو ژنە بەستەزمانە قەناعەت پێ بکەن کە بەیانی سەعات نۆ بێت بۆ نەخۆشخانە! دەنا جارێکی تر فەحس بۆ هیچ نەخۆشێک ناکەم!

بۆ ئێوارەکەی ژنانی بەرودراوسێی هوروژمیان بۆ لای من هێنا، بۆ ئەوەی قەناعەتم پێ بکەن کە بچم بۆ نەخۆشخانە.

ڕۆژی دوایی لەگەڵ ژنێکدا کە تورکی دەزانی چووم بۆ نەخۆشخانە، دکتۆرەکە بەگەرمی پێشوازی لێکردین. ئەو ژنەی کە لەگەڵمدا بوو هەموو بەسەرهاتەکەی منی بۆ گێڕایەوە، ئەویش بە خەفەتەوە گوێی بۆ شل کردبوو. پاشان داوای لێکردین کە بچین بۆ ژوورێکی دیکە تا ئەشیعەی قۆل و قاچم بگرێت. پاشان گەڕاینەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و چای بۆ بانگ کردین.

دکتۆر وێنەکانی خستە بەر ڕووناکییەک و لێیان وردبووەوە، بۆڵەیەکی لە دەم هاتە دەرەوە:

- ئۆ خوای گەورە! لە بیست و شەش ساڵ لەمەوبەرەوە...!

ڕۆژی دواتر خۆم لە قاوشی عەمەلیاتدا بینییەوە. دوای ئەوەی خەویان لێخستم، دوو گوللەیان لە قاچمدا دەرهێنابوو، بەڵام گوللەی سێهەمیان دەرنەهێنابوو چونکە کەوتبووە لای بۆرییەکی خوێنەوە، بەڵام هیچیان لە قۆڵم نەکرد چونکە هیچ گوللەیەکیان تێدا نەدۆزیبووەوە.

لە دوای نەشتەرگەرییەکە چاوم هەڵهێنا، بینیم دکتۆرەکە لە پشت سەرمەوە دانیشتووە. گوللەکانی نیشان دام، ویستی شتێکم پێ بڵێت، بەڵام من لێی حاڵی نەبووم، بۆیە بانگی وەرگێڕەکەی کرد و بە قوڕگێکی پڕ لە گریانەوە گوتی:

باشە ئەم ژنە بەستەزمانە چۆن توانیویەتی بیست و شەش ساڵ بە دوو گوللە کە لە قاچیدا بووە بەرێگادا بڕوات؟ ئەی چۆن دەتوانێت کاروبارەکانی خۆی بە قاچێکی شەل و قۆڵێکی ئیفلیجەوە جێبەجێ بکات؟ ئەم ڕۆژە بۆ من جوانترین، بەڵام هەمانکات ناخۆشترین ڕۆژی ژیانی دکتۆریمە، بەداخەوە کە ناتوانم بەتەواوەتی چاکی بکەمەوە، ئەمەش شەرمێکە هەتا هەتایە وا بە تەوێڵی کۆماری تورکیاوە. کە وەرگێڕەکە قسەکانی بۆ دەکردم بە کوردی، دکتۆرەکە هەردوو گوللەکەی خستە ناو کیسێکی بچوکەوە و بە پەتێک گرێیدا و خستییە گیرفانی چاکەتەکەیەوە.

دوای بیست و پێنج ڕۆژ لە خەستەخانە دەرچووم، بەڵام سەرەڕای هەوڵی زۆری دکتۆرەکە قاچم و دەستم بە تەواوی چاک نەبوونەوە.

دوو ساڵ و نیو بەسەر ژیانی نێو شاردا تێپەڕی، قسە و قسەڵۆک لێرەش وەکو لادێ بڵاودەبوونەوە. ئەو قسانە زۆر نارەحەتیان دەکردم، بەڵام خۆشم دەمزانی کە دەردی من دەوا ناکات. کەس نەیدەوێرا ڕووبەڕوو هیچ شتێکم پێ بڵێ! ئێوارەیەکیان لەگەڵ ئەو ژنانەی کە سەردانیان دەکردم ئەو مەسەلەیەم هێنایە گۆڕێ، بەڵام ئەوان بەتەواوەتی نکۆڵیان لەوە دەکرد کە بە خراپە باسی من کرابێت، بەڵام هەندێک ئامۆژگاریشیان کردم:

تۆ ژنێکی جوان و گەنجیت و گەورەبوویت، کاتی ئەوە هاتووە شوو بکەیت، شتێکی ئاساییە قسە و قسەلۆک دوای کچێکی جوانی وەکو تۆ بخرێت. ژیان بۆ کەسێکی وەکو تۆ بە تەنها کارێکی دژوارە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ماڵی بێ پیاو شتێک نییە مرۆڤ بیری لێبکاتەوە، بۆیە ڕەنگە ئەو قسەلۆکانە درێژەیان پێ بدرێت، بەڵام ئەگەر تۆ بتەوێت و ڕازی بیت ئەوا ئێمە دەتوانین پیاوێکت بۆ بدۆزینەوە.

بە توڕەییەوە پێم گوتن، مار بەسەری زمانتانەوە بدات. ماوەیەکی زۆر بە دژی ئەو پێشنیارەی ئەوان وەستامەوە، بەڵام ئەوان هەر کۆڵیان نەدا، بە بەردەوامی باسی ڕێزگرتن لە داب و نەریتیان دەکرد. ڕاستییەکەی ئیتر ڕێگام لەبەردەمدا نەمابوو، بۆیە پێم گوتن باشە بیرێکی لێ دەکەمەوە! ئیتر هەر ئەوە بوو، دەستیان بە باسکردنی عەلی ناوێک کرد کە من تەنیا بە دەموچاو دەمناسی، ئەویش وەکو من قۆلێک و قاچێکی ئیفلیج بوو. ماوەیەی چەند ڕۆژێک لە دڵی خۆمدا پرسیارەکەم تاوتوێ کرد، دوای ئەوەی کە هێندەیان باس کرد، منیش ماندوو بووم و تەسلیمی داخوازیەکەیان بووم.

ڕاستییەکەی من دەربارەی عەلی زۆرم نەدەزانی، هەروەها حەزم لە شووکردن نەبوو، بەڵام چارەنووس، داب و نەریت و دەوروبەرەکەم کارێکیان کرد، چی دیکە بەرگەی بەربەرەکانێ نەگرم، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەو هاوسەرگیریەی کەم تا زۆر بە زۆر پێیان کردم.

هێشاتە چەند ڕۆژێک بەسەر زەماوەندەکەماندا تێنەپەڕیبوو، بۆم دەرکەوت من و عەلی لە دوو دنیای جیاوازدا دەژین. عەلی پیاوێک بوو هیچ بەرپرسیاریەتیەکی

نەدەخستە سەر شانی خۆی، هیچ ئیحساسێکی نیشان نەدەدا، ڕێزی نەدەگرتم، پێدەچوو قەت فێری خۆشەویستی نەبوو بێت. ئەمە جگە لەوەی گوێی بە ماڵەکە نەدەدا، هەموو ڕۆژێک زوو دەڕۆیشتە دەرەوە. تەنیا جارێکیش پرسیاری ئەوەی لێ نەکردم کە ئاخۆ من ڕۆژانە بەتەنیا چی دەکەم، چی دەخۆم، بەڵام ئەو بۆ خۆی دەچوو بۆ ڕێستوران و دەیخوارد و دەیخواردەوە. زۆر دڵی هاوڕێکانی ڕا دەگرت، ئێواران بە سەرخۆشی دەهاتەوە. من لەبەر قسە و قسەڵۆک و داب و نەریت بوو کە شووم کرد، ئێستا دەبوو ئاگام لەو سەرەتانەش بوایە. سەرەڕای ئەو هەموو نەهامەتیانە، سکیشم پڕ بوو، ناچاربووم نۆ مانگ کوڕەکەی لە سکمدا هەڵگرم، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت چ ئازارێکم چێشت.

هەر ئەو ڕۆژەی منداڵەکەم بوو، هەوڵمدا بە هەر شێوەیەک بووە، لەو منداڵە بەدبەختە ڕزگارم بێت. بۆیە تەسلیمی دوو سستەرم کرد کە دوو ڕاهیبەی ئازەری بوون، لەو کاتەی کە بۆ نەشتەرگەرییەکەم لە خەستەخانە خەواندبوومیان ناسیبوونم. بۆم ڕوونکردنەوە کە لە لە چ حاڵێکدا دەژیم و منداڵەکەم تەسلیم کردن و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. من دەمزانی لەو ژیانەی تێیدا بووم نەمدەتوانی بە شێوەیەکی باش ئەو منداڵە پەروەردە بکەم، کاتێک دەستبەرداری منداڵەکەم بووم، وام هەست دەکرد پارچە پارچە دەکرێم.

ئەو ڕووداوە بە ئازارە سەرەتایەک و نیشانەیەک بوو بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێک. گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە چیتر پابەندی داب و نەریت نەبم، ڕۆژێک دوایی ئەوە بڕیارمدا لە عەلی جیاببمەوە. بەڵێنم بە خۆمدا کە هەرچییەک بێتە ڕێگام

لە پەیوەندی لەگەڵ ئەو بڕیارەدا، پشت گوێی بخەم. چیتر لەگەڵ عەلی قسەم نەدەکرد، هەرچەند ئەو بۆخۆشی دوای ئەوەی منداڵەکەم لە نەخۆشخانە بەجێهێشت نەهاتەوە بۆ ماڵەوە. چووم لە ناوەڕاستی بازاڕدا دۆزیمەوە و پشتەملیم گرت:

وەرە لەگەڵم هەی جانەوەر! دەبێت بچین بۆ دادگا! عەلی دەستی بە پاڕانەوە و لالانەوە کرد، بەڵام من هەر سوور بووم لەسەر بڕیارەکەی خۆم و ناچارم کرد بێتە بەردەمی مەحکەمە، قۆڵم گرت و بردمە بەردەمی حاکم و باسی ڕەوشی خۆمم بۆ کردا

حاکمی بەڕێز، دەمەوێت لەم پیاوە جیاببمەوە. ئەو قسانەی من بۆ حاکم وەکو موفاجەئەیەک وابوو، بڕیاری خۆی داو، ئیتر جیابوونەوەکەمان بوو بە ڕاستییەک.

## ٢

بە هۆی جیابوونەوەوە بووم بە "بێوەژنی" گەڕەک. چونکە من چیتر بە تەپڵی داب و نەریت هەڵنەدەپەڕیم، ئیتر لەو ڕۆژەوە بەتەنیا مامەوە، ژنەکانی دراوسێم سەردانیان نەدەکردم. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک پێیان وابوو کە کارێکی باشم کردووە، بەڵام نەیاندەوێرا بە دەنگێکی بەرز ئەوە بڵێن، بەڵکو هەموو خەتاکەیان بە چارەنووسەوە دەبەستەوە.

چەند ساڵێک دوای ئەوە کەوتمە داوی خۆشەویستی پیاوێکەوە کە هەر لەو گەڕەکەی ئێمە دەژیا، نامەوێت ناوی بهێنم، چونکە بەڵێنم پێدابوو کە تا ماوم ناوی نەدرکێنم. یەکەمجار کە بینیم زۆر لە یەکتریمان ڕوانی، بۆ یەکەمجار بوو لە ژیانمدا هەستم بە خۆشەویستی دەکرد، تەنانەت ئەو بۆشاییەی کە ژیانی منی قورس کردبوو، لەسەر شانم لاچوو.

ئەو بە جۆرێک دڵی منی بردبوو، منێک پێشتر ئەوەی پێی بگوترێت خۆشەویستی هەستم پێ نەکردبوو. تا زیاتر لێی نزیک دەبوومەوە و زیاتر دەمناسی زیاتریش حەزم لە ژیان دەکرد، ڕەنگی پەریووی ڕووخسارم، جارێکی دیکە ڕەنگیان تێزایەوە.

ماوەیەک بە دزییەوە یەکترمان دەبینی، دڵنیا بووم لەوەی کە ئەویش منی خۆشدەوێت، هەر ئەوەش وای لێکردم کە هەموو دابونەریتەکان بخەمە ژێر پێمەوە، بانگی بکەم بۆ ماڵەوە بۆ لای خۆم. بەو دەستپێشخەرییەی من بە جارێک زەندەقی چوو، هەوڵمدا هەرچۆنێک بووە ئارامی بکەمەوە.

- پیاوێک خۆشەویستی بکات ناترسێ!

ئەوە بوو ئێوارەیەکیان پێی لە جەرگی خۆی نابوو و هات و لە دەرگای دا. بەو شێوەیە لە حزووری خوا و فریشتەکاندا زەماوەندی خۆمان ڕاگەیاند. هەر ئەو شەوەمان کردە شەوی چوونە پەردەمانەوە، زۆری خایاند تا بتوانین وشەیەک لەسەر ئەو پەیوەندییەی خۆمان لای کەسێک بدرکێنین. من بۆ خۆم دەمویست باسی خۆشەویستەکەم بۆ هەموو دنیا بکەم، بەڵام ئەو دەترسا چونکە بە دڵنیاییەوە قسەو قسەڵۆکیان دەخستە دوامان، لە داب و نەریت زۆر دەترسا.

ئەو ڕۆژەی کە پێم گوت سکم هەیە بەجارێک زەندەقی چوو، بەشێوەیەک بیری لەوە دەکردەوە کە شار بەجێ بهێڵێت، زۆری لێ پاڕامەوە:

- مەترسە، خۆتم لێ ون مەکە. ئەگەر بشمکوژن و تەنانەت بە بێ دادوەر توندترین سزام بدەن، لای کەس بە یەک وشە باسی تۆ ناکەم.

ئاخر من بۆ ئەوە بانگم کرد بۆ ماڵەوە بۆ لای خۆم تا بچمە ئامێزییەوە، چونکە خۆشم دەویست. ئەو هیچ شتێکی نەبوو کە سەرزەنشتی خۆی پێ بکات. ئەگەر تاوانێکیش لەو کارەدا هەبوو بێت ئەوە گوناهەکەی لە ملی مندا بوو. بەستەزمانە، ئەو کەسێکی خۆش دەویست کە پێشتر کەس خۆشی نەویستبوو.

من پەیمانم پێدا بوو.

کاتی ئەوە هاتبوو کە منداڵەکە بە دونیا بهێنم. تا دەهات سکم گەورەتر دەبوو، بەلام من پێموابوو کە پێویست ناکات لە ترسی خەڵک سکپڕیەکەم بشارمەوە.

دوای ئەوەی کە لە عەلی جیابوومەوە کەس نەیدەوێرا ڕەخنەم لێ بگرێت لە پای ئەوەی کە پەیڕەوی داب و نەریتم نەکردووە، ڕاستییەکەی ئەو شتانە تەنیا قسەی قۆڕبوو.

منداڵەکەم بوو، زۆربەی زۆری خەڵک وەکو زۆڵ چاویان لێ دەکرد، بەڵام بەلای منەوە بەرهەمی خۆشەویستی نێوان من و ئەو پیاوە بوو.

منداڵەکەم ناونا موراد، ناوێک بوو لەگەڵ چارەنووسی ئەودا دەگونجا. هێندە جوان بوو دەتگوت ئەستێرەیە، لە دڵەوە باوکیم خۆشدەویست. لەگەڵ هاتنی ئەو منداڵەدا خۆشیم بۆ گەڕایەوە و تەنیایی خۆمم لە بیر چوو بوووە. ناچاربووم بەسەر زۆر کۆسپدا سەرکەوم تا بتوانم پەروەردەی بکەم، بەرگەی نارەحەتییەکان بگرم. گوێم بەو هەموو ئیهانەتەی بە ناوی «زۆڵەکەی ئیماوە» پێم دەکرا، نەدا. ئێستاش ئەوەتا کەوتوومەتە پایزی تەمەنمەوە. ئێستاش خەفەت بۆ ئەو ژیانە خۆشە دەخۆم کە نەبوو بە نسیبم، دەشزانم کە هەر بەو خەم و خەفەتانەوە سەر دەنێمە نێو گۆڕەوە. ئەوە هەموو ئەو شتانە بوو کە بۆم باس کردیت. ئێستاش بەو پیرییە و بەو ئیفلیجییەمەوە هەر لەو تەنیا ژوورەدا دەژیم.

دەبێت ئەوەشت پێ بڵێم. ئەوەی کە بۆ تۆم گێڕایەوە، لە ژیانمدا بۆ کەسی دیکەم نەگێڕاوەتەوە. ڕاستەیەکەی ئەوەیە

من نەمدەویست باسی ژیانی خۆم و ئەوەی بەسەرم هاتووە بۆ کەس باس بکەم.

هەروەک بەڵێنم پێدایت، هەموو شتێکم لە نووکەوە بۆ گێڕایتەوە، لە ناخی دڵی خۆشمدا پێموایە کە دەبێت هەموو مرۆڤێکی ئاقڵ، کە بەشێک لەو بەسەرهاتەی منی بەسەردا هاتبێت، بە چاوێکی تەڕەوە دەتوانێت لەو مێژووەی من بگات، ئاخر قوڵ و قاچە شەلەکەم بۆ خۆیان زۆرشتیان هەیە کە بیڵێن.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە خاڵی کۆتایی بۆ ئەم بەسەرهاتە دابنێین و پێت دەڵێم: شەوێکی خۆش!

ئێما شەل لە پارێزەرەکە دەچێتە پێشەوە، چاوەکانی ماچ دەکات و دەڕواتە دەرەوە و، لە نێو تاریکییەکەدا ون دەبێت.

# قسەی دوایی

## مەنفا

دوای ئەوەی پارێزەرەکە قسەکانی ئێمای لای خۆی نووسییەوە، ئەو دەفتەرەی قسەکانی تێدا نووسیەوە، خستیە نێو جانتا دەستییەکەیەوە، پاشان چوو بۆ ژووەرەکەی خۆی تا بخەوێت، بەڵام بەهۆی ئەو دوودڵییەی تێی کەوتبوو خەو نەدەچووە چاوی، وەکو ئەو گێڕانەوەیەی لێهاتبوو کە لە زیندانی دیاربەکر بەر گوێی کەوتبوو. لەگەڵ ئەوەی چل و چوار ساڵ تێپەڕوە، کەچی وا هەست دەکات کات لە شوێنی خۆیدا وەستاوە، مێژوو لە جێگای خۆیدا چەقیوە.

کەمێک پێش ئەوەی لە خەو هەستێت، خەوی بە سلێمانەوە بینی. قژە درێژەکەی وەکو پەرچەمێک با دەی هێنا و دەیبرد، بە هەردوو دەستی نیشانەی سەرکەوتنی نیشان دەدا.

ڕۆژی دواتر پارێزەرەکە دەچێت بۆ دیاربەکر و لە مەکتەبەکەی خۆی دادەنیشێت. هاوپیشەکانی باسی ئەو ڕووداوانەی بۆ دەکەن کە لەو ماوەیەی ئەو لە زینداندا بووە، ڕوویاندابوو. ژمارەیەکی زۆر لەو پارێزەرانەی کە وێرابویان

ئێما، کۆمەڵکوژییەکەی رژێمی سیم بینەر

هەڵوێست وەرگرن و لە دادگا بە کۆمەڵیەکاندا، زیندانییە سیاسییەکان بپارێزن، کەوتبوونە بەر هەڕەشەوە. هەندێکیان گیرابوون، بەشێکیشیان لە ترسی ئەوەی دووچاری هەمان چارەنووس نەبن پەشیمان ببوونەوە. ئەمەش مانای ئەوەی دەگەیاند کە سێ هەزار زیندانی بێ پارێزەر مابوونەوە. پارێزەرەکە بڕیار دەدات بە تەنیا پارێزگاری لەو سێ هەزار زیندانییە بکات؛ بۆ ئەو مەبەستەش پەیوەندی بە کۆمەڵێک دەستگای حکومییەوە دەکات. بەڵام بە ڕۆژی نیوەڕۆ دەبێتە قوربانی. لە لایەن دوو کەسەوە دارکاری دەکرێت و لێی دەدرێت، ئیتر لەوە تێدەگات کە ئەمە جگە لە هەڕەشەیەکی زۆر جددی، هیچ مانایەکی تر ناگەیەنێت. ئیتر لەوە تێدەگات کە ناتوانێت لە وڵاتێکدا پارێزەری بکات کە دادگا تەنها گاڵتەجارییەکە و هیچی دیکەنا. ئەوەی کە ڕووبەڕووی دەبووەوە، ڕاستییەکی ڕۆژانە بوو. بۆیە بڕیار دەدات عەبای پارێزەریەتیەکەی بسووتێنێت.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە سەردانی ئەندازیارێکی هاوڕێی دەکات، ئەویش خۆی شاردبووەوە، تا لە نیگەرانییەکانی خۆی ئاگاداری بکاتەوە. هاوڕێکەی بەڵێنی دەداتێ کە هاوکاری بکات تا وڵات بەجێبهێڵێت، هەڵبەتە ئەگەر ئەو خۆی بیەوێت. هاوڕێکەی کەمێک بیردەکاتەوە پاشان وردەکارییەکانی بۆ باس دەکات.

پارێزەرەکە جانتاکەی دەپێچێتەوە، ئەو نووسراوەیەی کە گێڕانەوەکەی ئێمای تێدا تۆمارکردبوو، هەروەها ئاخافتنی زیندانە سیاسییەکان لە کاتی چوونە بەر دەم دادگای سەربازی دیاربەکر کە کرابوونە دۆکیۆمێنت، دەخاتە نێو

جانتاکەیەوە. پێش ئەوەی خوا حافیزی لە هاورێکەی بکات، جانتاکەی نیشان دەدات:

ئەم جانتایە ئەو بەڵگانەی تێدایە کە گەواهی لەسەر ئەو تراژیدی و ئازارانەی کە بەسەر گەلەکەماندا هاتووە، دەدەن، بۆیە دەبێت بەشانمەوە بێت.

سواری سەیارەیەک دەبێت. شۆفێرەکە پێی ڕاسپێردرابوو کە ئەو و سێ کەسی دیکە بگەیەنێتە شارۆچکەی قزڵتەپە کە دەکەوێتە سەر سنووری نێوان تورکیا و سوریا. دوا نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو کە گەیشتنە ئەو شارۆچکەیە، دەبوو لەماڵێک بمێننەوە تا شەو دادێت. لەو ماوەیەی کە چاوەڕوانیان دەکرد، جارێکی دیکە گوێبیستی ئەو تاوانانە دەبێت کە لە زیندانی دیاربەکر درێژەیان هەیە.

نیوەشەو سەیارەیەکی دیکە دێت و دەیانبات بۆ سەر سنوور. کابرایەکی قاچاخچی بە نێو دەشتەکاندا ڕێنوێنیان دەکات، جار بە جارێک دەشتەکە ڕووناک دەبێتەوە، بۆیە دەبوو بە گاگۆڵکێ بڕۆن و گوێ قوڵاخ بن. ماوەیەکی دیکە دەڕۆن، ڕێنیشاندەرەکەیان تەلە دڕکاویەکان دەقرتێنێ و پێیان دەڵێت بە جێ پێکانی ئەودا بڕۆن.

پارێزەرەکە ئەو جانتایەیی کە بە دڵ و گیان بەڵگەکانی تێدا هەڵگرتووە، گەواهی لەسەر ئەو کارەساتە دراماتیکیانەی کە وڵاتەکەی پێیدا تێدەپەڕێت دەدات، لەگەڵ خۆی هەڵگرتوون. کاتێک لە ڕێگا دەیەوێت هەستێتەوە قاچاخچییەکە پێی دەڵێت خۆت بدە بە زەویەکەدا. سەیرێکی لای ڕاستی خۆی دەکات لە دوورەوە شەوقی گڵۆپێ جێبێکی سەربازی دەبینێت کە تیشکەکانی لەویان دەدا. قاچاخچییەکە بە دەنگێکی نزم

ئاگاداریان دەکاتەوە، پێش ئەوەی ئەوان دەمیان بکەنەوە:

- هاوڕێیان ئێمە لە نێو کێڵگەیەکی مین داین، ئاگاتان لە خۆتان بێت، وریابن بە هیچ لایەکدا لا نەدەن، چونکە ئێرە پڕە لە مین. ئەگەر قاچتان بەر مینێک بکەوێت ئەوا پارچە پارچە دەبن. ئەو جێبەی دەیبینن ئەوە پاسەوانیی ڕێگا و بان دەکات، نەجوڵێنەوە دەنا دەماندۆزنەوە.

پاش کەمێک جێبەکە ون دەبێت.

پارێزەرەکە لەسەر گازی پشت ڕاکشاوە، جانتاکەی لە تەنیشت خۆیەوە داناوە و لە ئاسمان دەڕوانێت. چاوی لە ئەستێرەکەی خۆی گیر دەبێت، کە لە نێو هەزاران ئەستێرەدا لەو بەرزاییەوە تیشک دەهاوێت. هەتا ئەو شەوە هیچ جارێکی دیکە خۆی وا بە ڕووخاویی و دوورە دەستی نەبینیبوو.

# بەڵگە

نامەی سەرۆک عەشیرەتەکانی دێرسیم
بۆ سکرتێری یەکیەتی نەتەوەکان (١٩٣٧)
دێرسیم ٢٠ نۆڤێمبەری ١٩٣٧

**بۆ سکرتێری یەکیەتی نەتەوەکان لە جنێڤ**

**بەڕێز سکرتێری یەکیەتی نەتەوەکان**

دوای ئەوەی بە چەندین شێوە هاوارمان بۆ دنیای شارستانێتی هێنا تا سەرنجتان بۆ سەر سیاسەتی لە ڕەگوڕیشە هەڵکیشان کە لە لایەن دەوڵەتی تورکییەوە بە دژی هەموو کوردستان بە گشتی و ناوچەکەمان "دێرسیم" بە تایبەتی، ڕابکێشین، لە ماوەی ئەم پانزدە ساڵەی دوایدا بە شێوەی جۆراو جۆر پیادەیان کردووە. ئیمرۆ بە ناچاری جارێکی دیکە ڕووی دەممان لە دەستگاکەی ئێوە، دنیا، مافی مرۆڤ و دادگای بەرزی شارستانییەت دەکەینەوە.

بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە ژیانی کورد کە(زمان، کولتوور، ئێتنیک و مێژوویان لەگەڵ هی تورک جیاوازە) لە سەر خاکی مێژوویی خۆیان کە سەدان ساڵ پێش تورکەکان

تێیدا ژیاون، ئێستاش دەوڵەتی تورک لە بەردەمی مێژوو و دنیادا خۆیان تاوانبار دەکەن، کاتێکیش بە قێزێونترین شێوەی درۆ و تاوانەکانی خۆیان دەشارنەوە کە تەنانەت باربارەکانیش لەبەردەم وشەی "شارستانییەتدا" سوور هەڵدەگەڕێن. نەتەوەی کورد بە پیر و گەنجیانەوە، بە ژن و منداڵیانەوە، داوای شتێکی زیاتریان نەکردووە لەوەی کە ئەو ئەرکە پیرۆزەی مێژوو و شارستانییەت پێی بەخشیوون ئەوەیش لە ڕێگای گەشەدان بە زمان و کولتوور لە خانەی مێژووییاندا، کە چی دووچاری سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزیی بوونەتەوە کە دەوڵەتی تورکیا بە هەموو شێوەیەک پیادەی دەکات و هەموو جۆرە میتۆدێک بۆ ئەو مەبەستە بە کاردەهێنن.

بۆ خنکاندنی نەتەوەی کورد میتۆدی پاکتاوکردنی نەژادیی لە شێوەی بەزۆر ڕاگوێزان، خێزان بە خێزان، گرووپ بە گرووپ لەم دێ بۆ ئەو دێ، بە کاردەهێنن، بە تۆپ و شەستیر، لە سەر ئەرز و لە هەواوە هێرشمان دەکەنە سەر، گازی خنکێنەرمان بە دژ بەکاردەهێنن.

ئێمە بەتایبەتی سەرنجتان بۆ سەر هەندێک لەو میتۆدانە ڕادەکێشین کە بەتەواوەتی دەکەونە خانەی پاکاتاوکردنەوە و دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت بە ناوی کاری شارستانێتییەوە ئەنجامیان بدات. سیاسەتی ناوخۆی تورکیا زیاتر ئەم جۆرە میتۆدانە بەکاردەهێنێت:

- داخستنی خوێندنگا کوردییەکان، قەدەغەکردنی هەموو جۆرە بڵاوکراوەیەکی کوردی و ئەوەی پێی دەگوترێت (خوێندن و نووسین) و تەنانەت قسەکردن بە زمانی کوردی قەدەغەیە.

- ڕێگرتن لە منداڵانی کورد کە بەشداری خوێندنی باڵا بکەن، تەنانەت بە زمانی تورکی و لە خوێندنگا تورکییەکانیشدا.
- لە ڕێگای یاسا نهێنیەکانەوە ڕێگا لە ئەفسەرانی کورد دەگیرێت لە سوپای تورکیدا پەروەردە بکرێن.
- هیچ کوردێک بۆی نییە لە دامەزراوە دەوڵەتییەکاندا کاربکات لە ناوچەکەماندا (هەر لە ئێستاوە بۆ ئەو مەبەستە یاسای تایبەتی دانراوە).
- لە کتێبە زانستی و لە گۆڤارە مێژوویی و جوگرافییەکاندا هەموو وشەیەک کە پەیوەندی بە کوردەوە هەبێت قەدەغە کراوە، بۆ نمونە وشەی "کورد" و "کوردستان".
- ناچارکردنی بەشێک لە کوردەکان تەنانەت ژن وکچەکانیشیان لە ئەنەتوڵیا، بە زۆر و لێدان بەشداری بکەن لە دروستکردنی بینا سەربازییەکاندا، ئەمەش بە شێوەیەکی هێندە وەحشیانە کە سەردەمی وەحشەتگەرایش بە تۆزی پێیان ناگات.
- ڕاگوێزانی خەڵکی کورد بۆ ناوچە تورکییەکان لە شێوەی گرووپی دە کەسیدا، ئەمەش دوای ئەوەی دەست بەسەر هەموو ماڵ و سامانێکیاندا دەگرن، ئەوەش بەو مەبەستەی کە نەتوانن ژمارەیان بگاتە زیاتر لە پێنج دەرسەدی ناوچە تورکییەکان.
- دابڕینی بەشێک لە ژنان و کچانی کورد لە خێزانەکانیان و ناچارکردنیان بەوەی لەگەڵ خێزانە تورکەکاندا بژین، بەبێ ئەوەی زەواج بکەن.
- بە تورککردنی بەشێک لە نەتەوەی کورد و پاکتاوکردنی بەشەکەی دیکەی.

دەوڵەتی تورکیا ئەم کردەوە وەحشییە بێ نموونانە ناو لێدەنێت "شارستانی". هەتا زیاتر دەوڵەتی تورکیا ڕاستییەکان بشارێتەوە، زیاتریش نەتەوەی کورد ڕووبەڕووی ئەو پاڵەپەستۆیانە دەبێتەوە و ناتوانن دەنگی خۆیان بە دنیای شارستانێتی بگەیەنن.

ئەو هێرشانەی دەوڵەتی تورک دەیانکاتە سەر نەتەوەی کورد، دۆزەخێکیان بۆ کورد دروستکردووە، بەتایبەتی لە ناوچەی دێرسیم کە دانیشتوانەکەی زیاتر لە سەد هەزار کەس دەبێت لە کوردستانی تورکیا. لە ناوچەکانی دێرسیم هەموو داو دەستگاکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە لە ژێر کۆنترۆڵی سوپا دان.

هەموو کارە دادوەرییەکان، تەنانەت ئاسایترین دادگای مەدەنی لە لایەن دادگا سەربازییەکانەوە بەڕێوە دەبرێن و کەسیش بۆی نییە پەنا بۆ دادگای باڵا بەرێت بۆ تەمیزکردنەوە حوکمەکەی. دەرکردنی ئەو ژمارە زۆرە لە حوکمی لە سێدارەدان لە لایەن ئەو دادگایەوە، کە نەدەتوانرێت بگۆردرێت یانیش بە شێوەیەکی ڕەسمی دانی پێدا بنرێت لەلایەن دەستەڵاتدارانی باڵاترەوە. ئازادکردن وەکو شتێکی دانسقە وایە، ئەویش دەبێت والی کە هەمانکات سەرۆک ئەرکانیشە ئیمزای بکات، دەبێت بە خێرایی جێبەجێ بکرێت ئەوییش سزای ماڵییە یانش لە سێدارەدانە. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە تەنیا چارەنووسێک لە لایەن ئەو دادگایەوە پەسند دەکرێت، مردنە. ئەمە بۆ کەسێکی کورد کە خوێندەوار بێت شتێکی قەتعییە هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە یازدە کورد لەو پەنجاوپێنج کەسەی بڕوایان بەو یاسای

لێبوردنە بەربڵاوەی کە دەوڵەتی تورک دەریکردبوو، هێنابوو، دوای چەندین مانگ لە دەستاو دەست کردن، پارێزگاریکردنی حقوقیان هەڵوەشایەوە، دەستەبەجێ لە سێدارەدران، ئەوانی دیکەیشیان فەرمانی کارکردنی بەزۆریان بەسەردا سەپاندن. لەم ناوچەیەی ئێمەدا هەموو کوردێک لەژێر هەڕەشەی پاکتاوکردندایە، ئەوەش لە ڕێگایی ئەوەی کە بەبێ هیچ بڕیارێکی دادگا، لە نیوەشەودا دەدەن بەسەر ماڵەکاندا، پیاوەکان لە خێزانەکانیان جیادەکەنەوە، یان لە پڕێکدا لە لایەن گرووپە چەتەکانەوە دەکوژرێن.

ڕێکخراوێکی تایبەتی لە ژێر ناوی "جەنراڵی پشکێنەر" کە شوێنی کارەکەیان هەموو کوردستان دەگرێتەوە، کاریان ئەوەیە کە بە ئاسن و خوێن ئەو یاسایانەی کە بە دزی لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە دەردەکرێن بخرێنە پراکتیکەوە.

ئەم چەوساندەوەیەی کە بەدژی مافە مرۆڤایەتییەکانی نەتەوەی کورد دەکرێت، چەندینجار لە کۆبوونەوە نێونەتەوەیی و ئاستە دیبلۆماسییەکاندا دران بە هەبوونی ئێتنیکی و هەبوونی نەتەوەییاندا نراوە، لە بنەڕەتەوە دژایەتی پرنسیپە ئازادیخوازەکانی دەستگای یەکیەتی نەتەوەکان دەکات، کە لای ئێمە تەنیا و گەورەترین دەسەڵاتە، ئێمە بڕوامان بەوە هەیە کە ئەم دەستگایە هیچ کاتێک لایەنی چەوسێنەران ناگرێت. بۆ ئەوەی یەکیەتی نەتەوەکان بتوانێت بڕیاری پێویست بۆ وەستانی ئەو تاوانکاریانەی کە بە چەندین شێوە بۆ پاکتاوکردنی نەتەوەی کورد خراونەتە گەڕ، دەربکات، پێویستە یەکیەتی نەتەوەکان، دەکرێت کەسێک بڵێت، با بەوردی باسی تراژیدیەکان بکەن، ئێمەش لە وەڵامدا

دەڵێین: تەنها ئەوەندەمان بەسە کە کۆمیتەیەکی لێکۆڵینەوەی نێونەتەوەیی سەردانی وڵاتەکەمان بکات.

بەڕێز سکرتێری گشتی،

ئێمە، دانیشتوانی ناوچەی دێرسیم، داوا لە یەکیەتی نەتەوەکان دەکەین کە هەرچی زووترە بەهانای کێشەکەمانەوە بێن، کێشەیەک کە دەکەوێتە خانەیەکی بچوکی ئەو مرۆڤایەتییەی کە یەکیەتی نەتەوەکان ددانی پێدا ناوە، دەبێت هەرچی زووترە کۆمیسیۆنێک دابنرێت لە پەراوێزی ئەو شتانەی سەرەوە کە باسمان کرد، بڕیاری کاریگەر بدرێت بۆ ڕێگاگرتن لە پاکتاوکرنی بە کۆمەڵی نەتەوەکەمان.

ئیمزا

بەناوی عەشیرەتەکانی دێرسیمەوە

# ئێما

## کۆمەڵکوژییەکەی دێرسیمم بینی

بەسەرهاتەکانی نێو ئەم کتێبە، گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانەیە کە لە کۆمەڵکوژی دێرسم (١٩٣٧ – ١٩٣٨) لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە ئەنجامدراوە. ئیما وەکو شایەتحاڵێکی زیندوو ئەوەی بە چاوی خۆی بینیویەتی و بیستویەتی بۆ پارێزەر حسێن یلدرم دەگێڕێتەوە. ئەگەرچی گێڕانەوەکە شێوەی ڕۆمانێکی وەرگرتووە، بەڵام نووسەر بەئەمانەتەوە ڕووداوەکانی نووسیوەتەوە و هێندە وردە لە گێڕانەوەکاندا ناو و پاشناوی کەسایەتیەکان و تەنانەت ناوی سەگەکەی ئیماشی وەکو خۆی تۆمارکردووە. بەڵێ ئەمە گێڕانەوەیەکی تراژدییە، تێیدا باسی هەرێمێک دەکات کە بە (دەرگای زیوینی) باکووری کوردستان ناو دەبرێت، دێرسیم.



لە بڵاوکراوەکانی
ڕێکخراوی کوردستان دیالۆگ